کۆماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە (١١٤)

# شانۆو... شانۆی کوردەواری

حەسەن تەنیا

کۆماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە (١١١)

# شانۆ... و
# شانۆی
# کوردەواری

حەسەن تەنیا

شانۆ..و

شانۆی کوردەواری

باسێکی هونەری تۆماریە بۆ

مێژووی شانۆی جیهانیو شانۆی

کوردەواریمان لە سەرەتای

دەستپێکردنی‌یەوە هەتا

سەرەتاکانی ساڵی

١٩٧٦



حەسەن

تەنیا



# ناوەڕۆك

| باس | لاپەڕە |
|---|---|
| **بەشی یەکەم** | |
| هەستێکی ناسك و دەروونێکی فراوان ـ احمد سالار ـ | ٥ |
| مێژووی شانۆو وێژەی شانۆیی . | ٩ |
| شانۆی کلاسیکی . | ١٩ |
| شانۆی سەدەی هەژدەهەم لە فەرەنسەدا . | ٢٦ |
| شانۆی ئینگلتەرە لە سەدەی شانزەهەمەوە . | ٢٨ |
| شانۆی نوێ . | ٣٤ |
| قوتابخانە تازەکانی شـانۆ . | ٣٦ |
| **بەشی دووەم** | |
| مێژووی شـانۆی کوردەواریمان . | ٣٩ |
| پێشەکی یەکی پێویست . | ٤٠ |
| سلێمانی . | ٤٢ |
| هونەری شانۆگەری لە شارەکانی تردا . | |
| بەغدا | ٨١ |
| قەلادزێ | ٨٦ |
| کۆیە | ٩١ |
| هەولێر | ٩٦ |
| کەرکووک | ١٠٥ |
| خانەقین | ١١٢ |
| دهۆك | ٢١٨ |
| هەلەبجە | ٢٢١ |
| | ٢٢٧ |
| **بەشی سێیەم** | |
| هونەری نواندن لە ئێستگەی کوردیدا . | ١٣٣ |
| هەڵسەنگاندنێکی سەرپێیی شانۆی کوردیمان . | |



# «هەستێکی
# ناسکو
# دەروونێکی فراوان»

ـ ئەحمەد سالار ـ



« ڕێبوارێ گـــەیشتە کێلگەیـەکو ســـەرنجی ووردی بەدێراوە بێدەنگەکانیا گێڕاو لەوەدا بوو کە دوا ئاهی ماندوێتی دەرچێ ، بیرێك هات بەمێشکیاو لە دلی خۆیدا ووتی : نەچووە بچێ ، با نەبێ بە قوڕت لە ســەر سنگا ، خۆ هێشتا زۆری ماوە بگەمە ئاوایی مەرامم .. ئەوسا دەنگی لێ هەل بڕیو ووتی :

هۆ ... هۆ لالۆ .. ئەوە بۆ بێ دەنگی ..؟! لالۆی کێلگەکەش سەرێکی هەلبڕی ، زۆر لەسەر خۆ وەلامی دایەوە کەبڕوایتە وەرزی سال.. وەرز ڕابوردو سەرماو سۆلە ئاوابوو ، مـالی پێچایەوەو ســروشت خۆی پۆشتەکردەوەو کێلگەکەمان دەتووت بۆ ســـەرشایی دەچێو ئالو والا ئەی نواند ، وەك بلێ چاو بەعەشق ئالاوی‌یەکی وای بەدەستەوە بێ ســەودا سەرانی گڕ تێبەردا لەو ڕەش‌بەلەکەدا ، بۆیە کاتێ ڕێبوارەکەی لەمەڕ خۆمان ڕێگای کەوتەوە ســـەر کێلگەکە ڕەنگێکی تری دیو دەنگێکی زولالترو بۆنێکی خۆش‌تری کردو ئاهێکی شادیو سەر سووڕ مانی پیـا هاتەوە ... پاش ماندوو نەبوونی لە یەکتری کردن خاوەن کێلگەکەی ئاشنامان چـەپکێ گولی ناسکی ڕەنگینی چنیو کردی بە بەرۆکی ڕێبوارەکەوەو دەستێکی دا بە شانیاو ووتی :

ئەمە داستانی ئێمەیەو فەرمو تا خۆر بەو دیو کێوەکانا شۆڕ نەبۆتەوە بگەرەوە ئاواییو ئەم لاوکە بچریکێنە . جا برای هونەرمەندم کاکە ( تەنیا ) ئەو چەپکە گولەی بۆمان هێناوەتەوەو ، ئێمـەش ســوپاسی ئـەو ماندووبوونەی دەکەین کە بەش‌بە حالی خۆم شایەتمانی ڕەوای بۆ دەهێنم کە ڕێبوارێکی چاوتیژو هەنگاو بە توانابوو بۆ هێنانەدی ئەم بەرهەمە ..

شاتۆکەش‌ن هەر چۆن بێ کێلگەیەکو گەیوەتە ئەوەی بلێین خەریکە لە خەم برەخسێو ئاوەدان بێت ..

گرنگی لەم کارەدا شەپۆلی لەمانای جوان سەردەخا ، لە پێشیانەوە کە تۆبەرەیەکەو گەلێ گولەگەنمی هێناوەتەوەو رزگاری کردوون لە وونبوونو سەرتیاچوون ... ئێمە بەرێزەوە ناوی ئەو سەربازە وونبووانە ئەهێنین کە شۆرەسواری مەیانی هونەری شانۆی کوردی بوون ... ئەوان ئەوەمان فێر دەکەن کە شانۆکەمان پێویستی بە سەرقالیو کۆششی لاوانی ئەمرۆیە کەبەردەوامی پیشان بدەن لە کاروانی هونەرماندا ، کاتی ئەوەش هاتووە کە بلێین شانۆ ئەو شیرینە شوخو شەنگەیە کە فەرهادانی سەوداسەری راستەقینەی دەوێ هەزار قولنگ بوەشێنێ لە پێناوی ساتێ لاواندنیا .

کاکە ( حەسەن تەنیا ) توانیویەتی لە بەرگێکی لواو لە باردا باسەکەی بگەیەنێ ... دەبێ ئەوەش نەخەینە پشت گوێو دەروازەی بە رووودا داخەین کە هەموو دەست پێکردنێ ئەرکێکی زیاتری دەوێ ، وەئەگەر هاتوو سەرچاوەی باسەکەش کەم بوو و دەست نەکەوت ئەوا کۆلتر دەبێ ... لەگەڵ ئەوەشدا ئەتوانین دەست نیشانی ئەم بەرهەمە بکەین وەك سەرچاوەیەکی بەهێز بۆ ئەوانەی لە ئایندەدا بیانەوێ ئاورێك لە دایكبوونی هونەری شانۆییمان بدەنەوە ..

شانۆنامەی مرۆڤایەتیەو هەرچۆن لە چاو هەڵهێنانو لە دایك بوونیەوە کەوەك پێداویستیەکی رۆژانەی مرۆڤ پەیدا بووەو بەیەکا چوونو بەربەرەکانیەکانی خستۆتە روو وەبۆتە پشتیوانی راستی لە ئەنجاماو بەیانی ئاسوودەیی هەڵهێناوەو دوژمنانو بیری درندانەو ترسی هەڵبریوە لە ئاسۆی تیاروانینو بیرکردنەوەی ئادەمیزاددا .

بۆیە شانۆی کوردیش وەك شانۆی میللەتانی دۆستو دراوسێ تووشی گەلێ چەرمەسەری بووە ... بەڵام کۆڵی نەداوە ، چونکە بوونو توانـاو بەردەوامی میللەتان پیشان دەدات ، وە هەرشانۆشە کە هەمیشە دەبێ بەکار بێت بۆ ووتنەوەی وانەی ژیان سەربەرزی تیایا بەمیللەت ، شانۆ لە دەنگو رەنگو جوولاندنەوەو هەست بەخۆشیو ناخۆشی هەموو ئادەمیزادێك دەخاتە روو ، لە پێناوی سەرکەوتنی ووشەی بەرزو پیرۆزی مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی سنوور نەناس ...

برام تەنیا ..

(گۆران) (دەرویش عەبدولا)ی پێناسینەوە کە نمونەی هونەرمەندێکە تا لەدەرویش عەبدولاوە فێری خەندە بەشینەوە ببین بەڕووی یەکتری‌یا ، تا هەموو شتێکی جوانمان خۆش بوێت‌و بەگیان ئاشنا بین لە تەك ئاسوودەیی هونەرا،دیارە تۆش چاك هەستت بەم ڕاستی‌یە کردووە بۆیە شوێن هەنگاویت هەڵ گرتووەو بەم بەرهەمەت خرۆشێکت لەیاد هێنایەوە بیرمان .

هونەرمەند ئەو کەسەیە کە وێڵی ڕاستی‌یە ، مانای مرۆڤێکە کە زۆر هەست بەکەم‌و کووڕی‌یەکان دەکاو چاتر هەڵدەشاخێ بەرووی چەوتی‌دا ، بۆیە پێویست دەکات کە هونەر زادەی باری ژیانی ئەو خەڵکە بێت کە تیا دەژی‌و پێش‌ڕەوایەتی بکات ، واتێدەگەم لە دوا ووتەدا چاکتر وایە بڵێم ئەم بەرهەمە ببێتە دڵنیاکەرەوەی لاوەکانمان بۆ زیاتر گرنگی دان بەشانۆ ، بەختیاریش لەبەرهەم بەدەست هینانی بەکەڵك دایە ، هیوادارم کاکی نووسەر بەم بەرهەمە بەختیار بووبێت‌و زیاتر بەردەوام بێ لەم کۆڕەدا ... ئیتر هەر بژیت » .

احمد سالار
١٩٧٦/٤/١٢
سلێمانی

□

- بەشی یەکەم -

□

## «مێژووی شانۆیی

## وێژەی شانۆیی»(١)

١ - نووسینەکانی ماموستام د . علی الزبیدی کە ئامۆژگای هونەرەجوانەکان ئەمان خوێند.

ب - الاخراج المسرحي - هیننج نیلمز .

ج - ماموستا ئەحمەد سالار .

د - دائرة معارف الشعب ژمارە ١١٨.



مێژووی وێژەی شانۆیی پارچەیەکە سەرلەبەری مێژووی وێژەیی،بەڵام تەنیا باسی یەك جۆر وێژە دەکات ، ئەویش وێژەی شانۆیی‌یە بەهەموو جورێکی‌یەوە ..

ئێمە دەربارەی مێژووی شـانۆ سـەرچاوەیەکی فراوانی وامان لەبەردەست نی‌یە کەبە هەوەسی خۆمان بتوانین لێی هەڵبژێرین‌و لە دەریای شینی‌دا چالاکی مەلەوانی خۆمانی لێ بخەینە کار ... تەنیـا ئـەوەندە هەیە کەلەم ماوەیەی دواییدا ـ بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدەهەمەوە ـ مێژووی وێژە بەگشتی بە جۆرێکی جیاوازو سەربەخۆ هاتەکایەوە ، بێ‌گومان لێرەشـا ، نووسەرەکان بەدەگمەن ئاوڕیان لە وێژەی شانۆیی ئەدایەوەو لـەو بابەتەوە ئەیان نووسی،لەبەر ئەوە ئێمە زیاتر نووسینەکانی بێگانە ئەکەینە ڕێڕەومان‌و لەم بارەیەوە زانیاری لێوەرئەگرین ... بەتایبەتی کـە ئەبینین کتێبخانەی کوردەواریمان هەریەکجار چۆڵو هۆڵە لـەم بارەیەوەو پیویستیشمان زۆرە بەروون کردنەوەی سەرچاوەی ئەم‌هونەرە مەزنەی کە بالاترین دەستی هەیە لە ووریا کردنەوەو ڕێپیشان‌دانی کۆمەلا ، لە کاتێکدا کە نیازیشمان هەیـە بناغـەیەکی بەهێز بۆ شـانۆی کوردەواریمـان لە چواچێوەیەکی بـەتینی تێ‌گەیشتن‌و رووناکی‌یا دابڕێژین‌و خەلکی بکەینە هاوڕێیەکی گیانی بـە گیانی شانۆ ....

« بۆچی مێژووی شانۆ بزانین .. ؟! »

مێژووی وێژەی شانۆیی بریتی‌یە لە لێکولینەوەو شـیتال کردنێکی مێژوویی‌ی وێژەیی بۆ دروست بوون‌و هاتنەکایەی شانۆو پەرەسەندنی هەر لەکۆنەوە تا ئێستا ، بۆ زانینی ئەو پلانەی پیا ڕۆشـتووەو ئەو گۆڕانانەی بەسەریا هاتووەوتا گەیشتۆتە ئەم پلەیەی ئەمرۆ ، تا بیکەینە بناغەیەکی پتەو بۆ دوارۆژێکی روون‌و کاری گەری شانۆی کوردەواریمان ..

لەبەر ئەمە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ بنچینەی دەست پێکردنی هونەری شانۆیی‌و ئەو پلە سەرپێڕیی یانەی کە پێیدا ڕۆشتووەو وردە وردە گۆڕانی بەسەراهاتووەو پێش‌کەوتووە .

« پێك‌هاتنی شانۆو دروست بوونی »

وەکو ووتمان بۆ ڕوونکردنەوەی کات‌و هۆو شوێنی هونەری شانۆیی پێویستە بۆ مێژووی گەلەکانی کۆن‌و لەناو ئەو مێژووانەدا بگەڕێین بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی دەست‌پێ‌کردنی ئەم هونەرە ، چونکە وەکو ئاشکرا بویە وە زۆربەی ئەم گەلانە هەندێ جار لە جەژنە دینی‌یەکانیان ، یان بە هۆی هونەری میللی خۆیانەوە زۆر وێنەو نەریتی وایان پیشان‌داوە کە ئەتوانین بڵێین شێوەیەکی شانۆیی ( دراماتیکی ) هەبووە ... زۆر لە مێژووناسەکان باسی ئەمە ئەکەن کە لەلای هەندێ لە گەلانی پێشوو هەبوو ، وەکو چینی‌و هیندی‌یەکۆنەکان‌و بەلکو هەتا لەلای یابانی‌یە کۆنەکانیش ، ئەمە لە ڕۆژهەلاتا، کەئەوەندە سەرچاوەمان لەو بارەیەوە کەمە ــ بەلکو هەر نی‌یەــکە ناتوانین بەوردی لێی بدوێین‌و باسی بکەین ... ، هەروەها ئەم دیمەنە ئایینی‌و گەلی‌یانە لەکۆنا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش ئەبیزا ، وەکو عیراق‌و میسرو ناوچەی ( الهلال الخصيب ) بەشێوەیەکی گشتی ، چونکە ئەوپاشماوانەی کە دۆزراونەتەوە زۆر باش ڕوونیان کردۆتەوە کە خەلکی ئەم ناوچەیە هەندێ وێنەو کاروباری وایان بەهۆی جەژنەکانیانەوە پیشان داوە کەبۆنی شانۆیی لێ‌هاتووە ، ئەویش بەمانایەکی ( تقليدی ) بۆ شانۆ ... هەتا ئەتوانین بڵێین کە بابلی‌یە کۆنەکانیش هەر ئـەم ڕەفتارەیان بووە ، بـەلام تائیستا هیـچ سەرچاوەیەکی ڕوونی وامان لەم گـەلە ڕۆژهەڵاتی‌یانەوە بۆ دەرنەکەوتووە وەکو لە مێژووی ( گریك )یانی یۆنانی‌یە کۆنەکاندا دەرئەکەوێ ، لەبـەر ئەوە بە ناچاری ڕوو ئەکەینە مێژووی یونان ، بەو مەبەستەی‌کە بنـاغەی مێژووی وێژەی شانۆیی لەوێوە دامەزراو هەتا ئێستاش مێژوو ناسـەکانی شـانۆ لەوێوە شـت لە بارەی مێژووی شـانۆوە وەرئەگرن‌و ئـەی‌کەنە دەسکەلای خۆیان ...

## « چۆن هونەری شانۆگەری لای یۆنانی‌یەکان دەستی پێ‌کرد ؟ »

ئەو زانینەی تائێستا بۆ ئێمە روون بۆتەوە ئــەوە ئەگــەیەنێ کــە : پێ‌گەیشتنی هونەری شانۆیی یۆنانی بەستراوەتەوە بەو کردەوەو رەفتارانەوە کە بەهۆی جەژنە ئاینی‌یەکانەوە پێشکەشیان ئەکرد ، وە بناغەی شانۆش بۆ خزمەتی پەرستگاو جەژنە ئاینی‌یەکان دائەڕێژرا ، تا وردە وردە لــە ئاین جیابووەوەو لە پەرستگا دوورکەوتەوەو بووبە هونەرێکی سەربەخۆ ..

یۆنانی‌یەکان لە ئاهەنگە دینی‌یەکانیانا کەبۆ خواکانیان ساز ئەدا بەتایبەتی بۆ خوا ( دیۆنیسیس ) ـ باس ژیانو بەسارهاتو رەوشتو گەورەیی‌یــان پیشانی خەڵــکی ئەدا بەشێوەی نواندن لە چوارچێوەیەکی ســـەرپێیی‌و ساکارا ... چیرۆکەکانی یۆنانی بۆمانی ئەگێڕنەوە کە ئەم ( دیونیسیس )ە ـ کەخوای مەی بوو ـ ( سیمیلی ) دایکی بەبرووسکەیەك مرد کەخواوەند ( جۆپیتێر )ی خۆشەویستی بۆی نارد ، پێش ئەوەی منالەکەی ببێ ، ئەمەش هەرلەبەر ئەوەی چونکە (سیمیلی)داوای لە (جۆپیتێر) کردبوو کە هێزو توانای خۆی بۆ بنوێنێ .. دوای ئەوە ئاوەڵەکە ( دیونیسیس ) چووە ئــەژنۆی جۆپیتێری باوکی‌یەوە ، هەتا کاتی لە دایك بوونی لەسەر شــاخی ( نیزا )کە لەوێ (نیمف) خواوەندی ڕوبارو بیرو دارستانەکان بەخێوی کرد، و هونەری کشتوکاڵ لە خواوەند ( سیلین )ەوە فێربوو .. هەروەهــا شــــتی زۆر سەیرتری لێ ئەگێڕنەوە ، وەکو بەشداربوونی لە هەنــدێ شــــەڕاو باسی ئازایەتی‌و نەبەردی ئەکەن لەو شەڕانەدا ، لەتەك ڕووخۆشی‌و گاڵتــەکردنی لەگەڵ هاوڕێکانیا ... هتد .

یۆنانی‌یەکان لەجــــەژنە ئاینی‌یەکانیانا باسی ئەم خوایەیان بەنواندن ئەکرد ، نواندنەکەش بەم شێوەیەبوو :

ئەکتەرێك قسەی ئەکرد ـ باسی ژیــــانی خواکەی ئەگێڕایەوە ـ کۆمەڵێك ( جۆقــە ) بــە گۆرانی بۆیــان ئەســەندەوە لەســەر ئەو باسە ئەڕۆییشتن‌و بە جۆرێکی فەلسەفی ماناو بیروباوەڕو توانــای مرۆڤیــــان دەرئەخست ، کە چۆن ئەم مرۆڤە پاشەڕۆژو ئەنجامی ژیــانی خۆی نازانێ‌و

زۆر جار کوێرانە هەوڵ ئەدا بەرەو کامەرانیو خۆش بڕوات کە چی تووشی هەزار دەردی سەریو ئەندێشە ئەبێو زۆریشیان لەو ڕێگە ترسناکەدا تەفروتوونائەبن • بێ گومان ئەم جەژنانەش زۆر بەڕێزو پیرۆز بوون لە لای یۆنانی یەکانو لە هەموولایەکەوە بۆسەیرکردنو بینینی وێنەی خواکانیان ئەهاتن ، لەتەڵوەرگرتنی چۆنیەتی ژیانیانو پیرۆزی لێیان •••

بەم جۆرە رۆژگار دێتو دەڕواتو ئەم ئاهەنگی نواندنەش پێش ئەکەوێو گۆڕان تیا ڕوو ئەدا وژمارەی ئەکتەرەکان لە یەکێکەوە لای ( تیسپیس ) ئەبێ بە دووان لای ( ئەسکیلۆس ) ، کە ( یۆریپیدیس )یش دێتە کۆڕی ئاهەنگەوە ئەکتەرەکان ئەکا بە سیانو بگرە زیاتریش ، بەم جۆرە چیرۆکی شانۆیی لەبیروباوەڕی کۆنو چیرۆکی بێ ماناوە گۆڕا بۆ شانۆیی یەکی پرماناو تازە بابەت کە لەسەر شانۆ ئەنوێزاو خەلکی تەماشای ئەکرد ••

## - ( تیسپیس ) -

یۆنانییەکان زۆر خوویاندابووە ئەم کاری هونەریو نواندنەو هانیان ئەدا ، ئەویش بەدانانی چەند خەڵاتو پاداشتێك بۆ نووسەرو ئەکتەرەکان ، ئەمە بووبە هۆی دەرکەوتنی زۆر نووسەرو چیرۆکی شانۆیی باشو ئەکتەری بەتواناو لێهاتوو ، ئەوکەسەی لەپێش هەموویانەوە بناغەی شانۆیی داڕشتو بەشێوەیەکی ڕێكو پێك بەڕێوەیبرد ( تیسپیس ) بووکەلە سەرەتای سەدەی شەشەمی پێش لەدایك بووندا ( زایین ) دەرکەوتو ئەستێرەی توانای لەئاسمانی هونەری شانۆییدا گەشایەوە •••یانی لەو ساڵانەدا کە وولاتی ( ئەسینا ) بە تەواوی دانیئا بە شانۆداو باوەڕی پێکردو ئاهەنگو گرەوی بۆ ڕێكخستو یارمەتیداو خەڵاتی بۆ دا تا •

پاشماوەکانی یۆنانی وا دەری ئەخات کە تیسپیس یەکەم کەس بوو دو ( تراژیدیا )ی هێنایەکایەوەو خستیە سەر شانۆ ، ئەمیش بەوەی کە هێنای لە جیاتی ئەو کەسەی باسی خواکەی ئەکرد ، ئەکتەرێکی دانا کە بەشێوەی نواندن ژیانی ئەو خوایە یان ئەو پاڵەوانە پیرۆزەی دەرئەخستو زۆر

شانۆگەری خەفەتباری‌و هەست بزوێنی پیشانی خەڵکیدا .. هەروەهـــا دەرکەوتووە کە یەکەم کەس‌بووە کە هونەری ( ماکیـاج )ی دۆزیوەتەوەو بەکاری هێناوەو ڕووپۆشی ( قنـاع )کردۆتە بەر ئەکتەرەکان .. یەکـەم کەسیشە کە ئیش‌و کاری شانۆی ڕێك‌خستوەو یاســـاو نەریتی تایبەتی بۆ داناوە .. هەر ئەمیش بوو کە شانۆگەری لە باس‌کردنی ژیـــانی خواوەندو پاڵەوانەکانەوە گۆڕی بۆ باس‌کردنی ژیانی خەڵکی یۆنانی‌و ڕۆڵەکانی گەل..

بەکورتی تیسپیس یەکەم کەس بوو کە گۆڕانێکی بنەڕەتی تـەواوی لە ئاهەنگە ئایینی‌یەکانی کۆنی یۆنانا گێڕا ..بێ‌گومـــان ئـــەم گۆڕین‌و دەستکاری‌کردنەی لە پێشەوە بەتوندی‌و لەلایەن گەورە پیاوانی ئەسیناوە بەربەرەکانی‌کرا،چونکە پێیان ناخۆش بووپاڵەوان‌و خواکانیان کە سەرچاوەی شانازی‌و شوێنی ڕێزو پەرستنیانن بـەو جۆرەو بەزینــــدوویی لەســـەر شانۆپیشان بدرێن .. بەڵام خەڵکی یۆنان هونەرەکەی ( تیسپیس )یـــان چووبوو بەدڵاو بەهەمو جۆرێك یارمەتی‌و هانیان ئەدا ، وەمیریش گـرەوو پاداشتی بەنرخی بۆ پێش‌خستنی شانۆ دائەنا .

( هۆراس )ی شاعیری ڕۆمانی ئەڵێ : « زۆر جار تیـسپیس بە دێهاتەکانا بە گالیسـگەیەك ئەسووڕایەوەو ڕەنگ‌و بۆیاخی لە گەڵ خۆیا ئەبردو لـەو دێهاتانەو لەبازاڕو لەناو کۆمەڵا چیرۆکی شانۆیی ئەنواند » ، ئەمـە ئـەوە ئەگەیەنێ کە تیسپیس پێش ئەوەی بێت بۆ ئەسینا هونەری نواندن پیشەی بووە ... بەڵام داخەکەم شانۆگەری‌یەکانی هیچی نەماوەتەوە ، هەرچەندە هەندێ کەس ئەڵێن چیرۆکە شانۆیی‌یەکانی ماوەو زۆر جاریش باس‌هەندێ لە چیرۆکەکانی ئەگێڕنەوەو ئەڵێن کە گوایا هی‌ئەوە ، بەڵام تا ئەمڕو گومانی لێ‌ئەکرێ ...

## ـ (ئەسکیلۆس) ـ

ئەسکیلۆس کوڕی ئۆفۆزیۆن لە ئیلۆسیس لە نزیك ئەسیناوە ساڵی ٥٢٥ پێشی‌زایین لە دایك‌بووە.. میژووناسەکان هەتا ئێستا قۆناغی منالی‌یان بۆ روون نەبۆتەوە کە چۆن ژیاوە ، تەنیا چیرۆکێکی باوەڕ پێ‌نەکراو نەبێ کە گوایا خۆی نوسیویەتی وتیایائەڵێ: «لەسەرەتای گەنجیما جارێکیان

لای باوکم نووستبووم ، لەخەوما خواوەند ( دیۆنیسیس ) هاتە لام وەپێی ووتم کەمن شاعیرم..و بووم بە شاعیر(*)»..

بەڵام ئەوەی کە گومانی تیا نی‌یە ئەوەیە کە ئەو گرەوو پاداشتانەی میری ڕێکی ئەخستو ئەیدا کاری تێ‌کردو لەبەهــاری ژیانی‌یەوە بڕیاری‌دا کەشــان بەشانی نووسەرە پێش‌کەوتووە پیرەکان هاوکاری ئــەم ئاهەنگانە بکات .. ئەوەبوو بەماوەیەکی کەم چووە ڕیزی شاعیرانەوە ، هەتا وای لێ‌هات لە دەوروبەری(٢٥)ساڵیدا شانی ئەدا لەشانی شاعیرە گەورەکانو بەرامبــەریان ئەوەســـتا ، لەوێنــەی ( کریلۆکوس )و ( پراتینـــاس ) و (فرینیکۆسی)... بەم جۆرە نزیکەی (١٠)ساڵ بەردەوام بوو ، هەتا شەڕی (فارسو گریك)بەرپابوو ، ئەمیش بووە چالاك‌ترین سەربازی ئۆردوگای یونانو لەشەڕی (ماراتۆن)و (سالامینا)دا ئازایی‌یەکی تەواوی نواند ، دوای ئەوەی‌فارســەکان لە یونــان دەرکــران، ئــەمیش گەرایەوە بۆ جیهــانی شـــیعر ، لەوکاتەشا ئەوانەی جــاران بەرامبەری ئەوەســتان پیری زێفی لێ‌سەندبوونو ئەو توانایەی جارانیان نەمابوو ، (سوفوکلیس) هێشتا منال بوو، لەبەر ئەوە ڕێگەی‌بۆتەخت بوو،بەکەم ترین ماوە گەیشتە سەرپۆپەی جیهانی وێژەو شیعرو هونەرو،بەهەوەسی خۆی کاروباری هونەری شانۆیی ئەبرد بەڕێوەو میریش هیچ دڵی نەئەشکانــد، ئەمیش وەنــەبێ خۆی لێ گۆڕابێ .. بەڵکو زیاتر هەوڵی ئەداو باشتر ئەی نووسی ، تا وای‌لێ‌هــات لە هەموو یونانا دەنــگی دایەوەو ناو بانگی گەیشتــە (هیبــرۆن) میری (سیراکۆسا)بانگی‌کردە لای خۆی‌و زۆر ڕێزی لێ‌گرت .. بەڵام لای میــر زۆر خۆی ڕانەگــرتو گەڕایــەوە بۆ ئەسینــا ، چونکــە تەنیــا لەوێ ئەیتوانی توانای هونەری خۆی دەربخاو بەناوبانگ‌تر بێ ...

ئەســکیلۆس بەردەوام بوو لە ســەرکەوتنو درەوشــاننەوە هــەتــا ئەستێرەی (سۆفۆکلیس)کەوتە ئاسمانەوە وڕووناکی ئەسکیلۆسی داپۆشی‌و

---

(*) چیرۆکە شانۆیی‌یەکانی ئەو سەردەمە هەمووی ئەبوایە بەشیعر بنووسرایە .

له سالی٤٦٧پیش‌زاییندا بەسەریان زاڵ بوو گـرەوی بـردەوە ، بـەڵام ئەسکیلۆسی هەر گوێی نەدایەو لە هـەوڵ دان دوانەکـەوت هـەتا بۆ دواهەمین جار لە سالی ٤٥٨ پێش زاییندا خـەڵاتی میری‌ی لە چیـرۆکی شانۆگەری (ئۆریستیسیە)دا وەرگرت‌و ، دوای ئـەوە بـەرە ودوورگەی (سقلیا) کەوتە ڕێ‌و لە شوێنێك کە پێی ئەڵێن(چیلا)هـەتا لە سالی٤٥٦ پیش‌زایین دانیشت‌وە هەر لەوێ مرد .٠٠

ئەسکیلۆسی ژمارەیەکی زۆری شانۆگەری نووسی بەڵام تەنیا حەوتی ماوەتەوەو ئەوی‌تری لەناو چووە ، ئەم حەوت چیرۆکە زۆر بە باشی توانـاو لێهـاتوویی ئەسـکیلۆسمان بۆ دەرئەخـاو شـارەزایەکی باشمان پێ فێر ئەکا٠٠٠چیروکە شانۆگەری‌یەکانیشی ئەمانەن:

(ئەوانەی ئەپاڕێنەوەـ)و (فارسەکان)و (حەوت هێرش‌بەرەکانی سەرثیبا)و ( پرۆمیثیوسی بەندکراو) (ئاگا مەمنوون)و (هـەڵگری قوربـانی‌یەکان )و (چاکەکەران)٠٠

## ـ ( سۆفۆکلیس )

ئەم شاعیرە بەرزە لە کۆلۆن سالی ٤٩٥ پێش‌زایین لە دایك بووە، هەر لە منالی‌یەوە حەزی لە مۆسیقا ئەکرد زۆر هەولی تیا ئەدا ، تا بەتەواوی فێری بوو، لە ئاهەنگی سەرکەوتنا لە شەڕی(سالامینا) بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵی گۆرانی بێژان هەڵبژێرداو زۆر دەوری لەو چیرۆکانـەدا بینی کـە پیشان ئەدران،بەڵام زیاتر خووی‌دایە چیرۆك نووسین هەتا لە سالی ٤٦٧ پیش‌زایین‌دا توانی بۆ یەکەم‌جار شانۆگەری‌یەك پێشکەش بکات‌و خەڵاتی یەکەمی وەربگرێ‌و بەسەر ئەسکیلۆسی پیرەمێردا زال بێ، دوای ئەوە هەموو دوو ساڵ جارێك(٤) چیرۆکی شانۆگـەری ئەخستـە بەردەمی لیژنـەی خـەڵات .٠٠ وەکو ئەڵێن ! سـۆفۆکلیس نزیکەی ( ٢٤ ) جـار خـەڵاتی وەرگرتووە٠٠٠

یۆنان لەکاتی ئەما لەو پەڕی پێش‌کەوتن‌و بەرزی‌دابوو، کاتێکیش کـە ڕۆژی ڕووناکی ئاوا بوون‌ڕۆیشت گڵۆڵەی سـۆفۆکلیسیش کەوتە لێژی‌و

پیری تەنگی پێ‌هەڵچنی، پاش ئەوەی کوڕەکەی کە ناوی (یۆفۆن)بوو شێتی‌و تێکچوونی دایە پاڵی زیاتر خەفەت سواری سەرشانی بوو ، ژیاتێکی پڕلە تێکۆشان‌و هەوڵدانی (٩٠) ساڵی لە ساڵی ٤٠٥ پێش‌زایینـدا مرد ... ، پەرستگایەکی گەورەی بۆ دروست‌کرد لە سەرمەزارەکەی وەکو هەموو پیرو پاڵەوانێك خەڵك ئەچوونە سەری‌و قوربانی‌یان پێش‌کەشی ئەکرد.

تائێستا بەتەواوی ڕوون نەبۆتەوە کە سۆفۆکلیس چەند چیرۆکی شانۆیی نووسیوەتەوە،هەندێك ئەڵێن: (١٢٣) چیرۆکە وە هەندێکیش ئەڵێن (١١٥) چیرۆکە...بەڵام لەم ژمارە زۆرە تەنیا(٧)چیرۆکی گەیشتۆتە ئێمە کەئەمانەن:

( ئەیاس )و ( ئەنتیگۆنا )و ( ئـەلێکترا )و( شـائۆدیب )و ( تراخین ) و ( فیلوکتیتیس )و ( ئۆدیب لە کۆلۆن ) .

## - (یۆرپیدیس ) -

ئەم نووسەرە مەزنەش یەکێکە لە دروست‌کەرانی بناغـەی ویژەی شـانۆیی یۆنانی .. لە ساڵی ٤٨٠ پیش زایین ــ لە کاتێکا یونـان لەوپەڕی بەهێزی‌و پیش‌کەوتنا بوو ــ لـە دایك‌بوو ، لەبـەر ئەوە نووسینـەکانی یۆرپیدیس زۆرتر شێوەی سەربـەستی بیروبـاوەڕ ،وجـوانی نووسین، ورزگاربوون لەکۆتەکانی نووسینی پیا دەرئەکەوێ، زۆرتـرینی ژیانی هەر لەئەسینا بەسەربردووە وهیچ‌فەرمان‌بەرێتی میری نەکردووە ، بەڵکو ژیـانی خۆی تەرخان کردووە بۆ نووسینی چیرۆکی شانۆیی‌و نواندن ، وەکوئەوترێ کاری ویژەیی لە ساڵی ٤٥٥پیش زایینداا دەست پێ‌دەکات ، واتە لەو کاتەوە کە شانۆگەری (کچەکانی بلیاس )ی پێش کەش بەلیژنەکرد لەگـەڵ چـەند چیرۆکێکی‌ترا، بەڵام هیچ خەڵاتێکی وەر نەگرت ، هەتا ساڵی ٤٤١ پیش‌زایین کە بۆ یەکەم‌جار خەڵاتی درایە .. بەشێوەیەکی گشتی یۆرپیدیس لـەوانی کە خەڵاتی کەمتر وەرگرتووە ، چونکە ئەو بیروباوەڕەی ئـەو ئەی‌نووسی زۆر نەئەچوە دڵیانەوە ... یۆرپیدیس نزیکەی(٩٢) چیرۆکی شـانۆیی نوسیوە ــ هەندێك ئەڵێن(٨٠)بەڵام تەنیا (١٩) چیرۆکی مـاوەتەوە کـە

ئەمانەهەندێکین : ( ئەلسست )و (میدیا )و ( تەروادی‌یەکان )و ( هێلانە )و ( هیپۆلیت )و ( هیراکلیسی شۆرشگێڕ ) ( ئەندروماك ) ( ئیفجینی لە ئۆلیس)...هتد.

بەم چوار نووسەرەمەزنەی یۆنان کۆتایی بەم باسە ئەهێنین‌و لاپەڕەیەکی تر لە مێژووی شانۆ هەڵ ئەدەینەوەو ڕوولەسەدەکانی ناوەڕاست ئەکەین جۆرێکی‌تر لە چیرۆك‌و نواندن لەسەر شانۆپیشان ئەدرێ ئەویش چیرۆکی شانۆیی کلاسیکی‌یە .



## « شانۆی کلاسیکی »

له سەدەکانی ناوەراستا ـ بەتایبەتی دووای ڕووخانی ڕۆمانی‌یـەکان لەئیتالیا[1]ـهونەری شانۆیی کەوتە لێژی‌و سـەردەمێکی زۆر بەنزمی‌و بێ‌کاری‌و دواکەوتنا ڕۆیشت ، ئەو شانۆیی‌یانەی پیشـان ئەدران تەنیا ئەوچیرۆکە ئایینی‌یانە بوون کە لە ئینجیل‌و مێژووی گاورانەوە وەرئەگیران، وەکو چیرۆکی دەرکردنی ئادەم لەبەهەشت‌و چیرۆکی قابیل‌و هابیل،یـان پیشان‌دانی ژیانی عیسا پیغـەمبەرو هـاوڕێکانی‌و پیـاوە پیـرۆزەکان، دەورەکانیش بەتایبەتی قەشەکانی ئەیان‌گێڕا ، نواندنەکەشی هەر لە کەنیسەدا پیشان ئەدرا..دوای ئەوە هێنایانە دەرەوە بۆ مـەیدانـە گشتی‌یـەکان، ئەوەندەی پێ‌نەچوو کۆمەڵە میللی یەکانیش تیـا بەشداربوون ..، شانۆ لە ناوەڕاستی مەیدانەکەدائەچەسپێنـراو (دیکـۆر)ی نەجـووڵاو لەسەری دائەکوتراو ئەکرا بەدوو بەشەوە ، لایەکی بەبەرزی‌یەوە بەبەهەشت دائەنـرا لایەکەی تری بەنزمی‌یەوە دۆزەخ بوو، لەبەینیشیاندا زەوی واتا (جیهان)بوو، خەڵکی بەهەشت بەوێنەی پەری دوو باڵیان پێوەبوو خەڵکی دۆزەخیش بەوێنەی شەیتان‌و جنۆکە بوون کەشـاخ‌و کلکیان پێوە بووە...هتـد ، بەهەمان شێوەی چیرۆکەکانی ئینجیل .

لەگەڵ ئەوەشا وردەوردە شانۆگەری میللیشی بەشـێوەیەکی سـاکار سەری بەرزکردەوە کە تەنیا ئامانجی پێکەنین‌و گاڵتەجاڕی‌و رابواردن بوو، ئەویش بە پیشان‌دانی هەندێ بینـراوی‌بێ‌جێ و بێ‌مانـاو بێ ئەنجام کە بەهیچ جۆرێ بەهونەری‌شانۆیی ناژمێررێ..

---

(۱) لەسـەدەی دوو.وە تـاسـەدەی هەشـت ـ یـانی لە سـاڵی(۲۰۰) دوای‌زایینەوە تا ساڵی (۸۰۰)دوای زایین .

بەم جۆرە شانۆ بەدرێژایی سەدەکانی ناوەراست بەردەوام بوو ، بەزمانی لاتینیو دوایی بە زمانی ئەو شوێنە کەتیا پیشان ئەدرا شانۆگەری بەساکاری پێشکەش ئەکرا . وەکو یەکەم زمانی فەرەنسیو زمانی ئیتالیو ئیسپانیو ئەڵەمانیو .. هتد .

بەڵام کاتێك کە گزنگی چەرخی ڕاپەرین[1] دەرکەوت ژیانیش بەشێوەیەکی گشتی بەرەو پێش‌کەوتن ملی‌نا ، بەتایبەتی پەیوەندی کردنی ئیتالیا بەرۆژهەڵاتو بەهۆی ڕێگای بازرگانی دەریای سپی ناوەڕاستەوە ، هەروەها شەڕەکانی خاچ ( الحروب الصليبيه ) .. ئەمانە باشترین هۆی ئەم پێش‌کەوتنە بوون ... لەلایەکی تریشەوە دۆزینەوەی چاپو قیبلەنوماو پەیدا بوونی چەند نووسەرێکی مەزنی وەکو ( دانتی ) ، ودوزینەوەی ئەمەریکاو ئوستەرالیاو پێش‌کەوتنی هۆی هاتو چۆ ... ئەمانە هەمووی بوونە هۆی ڕاپەڕینێکی نوێ بەتایبەتی لە ئیتالیاداکە زۆر پاشماوەی بەنرخی ڕۆمانیەکانو یۆنانیەکانی تیدابوو ، لەوێوە دەنگ بەرز بووەوە بۆ زیندوو کردنەوەی کەلەپوری کۆنی وێژەییو سوود لێوەرگرتنی بۆ ئەم ڕاپەڕینە .

بەم جۆرە خەڵکی سەریان کردە خوێندنەوەی وێژەی کۆن بەتایبەتی ڕۆمانیەکان کە نزیك‌ترین وێژە بوو لێیانەوە ، نووسەرە شانۆییەکان ـ بەتایبەتی ( کلۆدۆتیرانس و سنیکا )کە ڕاگری کۆڵەکەی نووسینی شانۆیی بوون ـ دەستیان‌کرد بە لاسایی‌کردنەوەی نووسەرە ڕۆمانیەکان ... ، بەڵام ئەمە هیچ سوودێکی بەشانۆ نەبەخشی،چونکەلەلایەکەوە نووسەرەکان خۆیان لەنووسینا بێهێز بوون ،و لەلایەکی تریشەوە لاسایی وێژە یەکیان ئەکردەوە کە زۆر بیستراوەو بینراوە ...، هەروەها نووسەرە شانۆییەکانی فەرانسیو ئیسپانی ئەوانیش دەستیان کرد بوو بە لاسایی‌کردنەوەی ڕۆمانیەکان ، ئەنجامی ئەمانیش لە هاوڕێ ئیتالیەکانیان باشتر نەبوو ... لەبەرئەوە بڕیار درا بگەڕینەوە سەر بنچینەی ئەم جۆرە وێژەیە کە ئەویش وێژەی یۆنانیەکان بوو ، تا زیندووی بکەنەوەو سوودی لێوەربگرن .

(١) لەدەوروبەری سالی ١٦٠٠ز .

بۆ ئەمە تێگەیشتووەکانی فەرانسە دەستیان‌کرد بە خوێنـــدنەوەی کتێبەکانی ( ئەفلاتون ) و ( ئەرســـتۆ ) ، وێژەوانەکان خوویان‌دایـــە خوێندنەوەو وەرگێڕانی چیرۆکە شـــانۆیی‌یەکانی یۆنان بۆ فەرەنسی‌و بیروباوەڕەکانی ئەرستۆ لە بابەت شانۆوە زۆر کاری تێ‌کردن‌و کردیـــانە پەیڕەو ، بەتایبەتی یاسای سێ‌یەکی ( الوحدات الثلاث ) واتە یەك‌کاتی‌و یەك شوێنی‌و یەك‌فرمانی شانۆیی ، لەتەك زۆر بیرو باوەڕی تریش ..

ئەتوانین بلێین مێژووی شانۆی کلاسیکی‌و ڕیرەوەکانی لەو کاتـــەوە دەست پێ‌ئەکا کە ( کۆرنێ ) چیرۆکی شانۆیی ( سید )ی بە سەرکەوتوویی پێشکەش‌کرد کە لە ئەنجاما بووبە هۆی داڕشتنی بناغەی ڕێڕەوی شانۆی کلاسیکی کەئەمانەن :

١ ــ پەیڕەوی‌کردنی یاسای سێ‌یەکی :

أ ــ یەك کاتی : ئەوەش مانای ئەوەیە کەکاتی ڕوودانی شـــانۆیی‌یەکە نابێ لە ٢٤ سەعات زیاتربێ ، یانی مەودای شەوو ڕۆژێك .
ب ــ یەك شوێنی : پێویستە شوێنی ڕووداوەکان لەیەك شاردابێ .
ج ــ یەك‌فرمانی شانۆیی : پێویستە یەك ڕووداوی ســـەرەکی لـــە شانۆگەری‌یەکەدا بێ‌و هـــەموو ڕووداوێکی تـــر لـــە دەوری ئەوڕووداوە سەرەکی‌یەدا بسووڕێنەوە .

٢ ــ پێویستە هەندێ ڕووداوی ترسناك‌و بەهێز لەسەرشانۆ پیشان نەدرێ، وەکو کوشتن‌و شەڕە شمشێرو خۆکوشتن ...

٣ ــ پەیرەو کردنی‌یەك ئاواز : یانی ڕۆیشتن لەسەر یەك‌خەت‌و تێکـــەڵاو نەکردنی پێکەنین بەخەفەتبـــاری ، یان تێکەڵاوکردنی پیـــاوماقووڵان بەڕەش‌و ڕووت ، یان گفت‌و گۆی ڕێك‌و پێك بە گاڵتەو جنێو ، یـــان کلۆڵی‌و ئازار بەکامەرانی‌و شـــادی ... هتـــد ، بەڵام ڕەخنەگرەکان بەرپەرچی ئەم یاسایەیان دایەوە ، بەتایـــبەتی لایەنگرانی قوتابخانەی ( ڕۆمانتیکی ) ،لەپێش هەموویانەوەش ( فیکتۆر هیگۆ ) کە بەوپەڕی

هێزەوە بەرامبەر ئەم یاسایەو لە چیرۆکی ( کرومویل )دا وەستا و ووتی کەئەم یاسایە لادانە لەیاسای سروشت کە چاکەو خراپەو گاڵتەو ڕاستیو پاکیو پیسو ... هەمووی لەسروشتا تێکەڵەو ئەم ڕاستیەش پێویستە لەسەر شانۆ دەربخرێ بۆدەرکەوتنی ژیانی ڕاستی مرۆڤ ، هیگۆ ( شکسپیر )ی کرد بە نمونە بۆ ئەمە ، و شانۆییەکانی شیتاڵکردەوەو ئەم ڕاستیانەی دەرخست .

٤ ــ پەیڕەوی کردنی (ڕێککەوتن) و (گونجاندن) : پێویستە شانۆییەکە لەگەڵ سروشتی ئێمەدا ڕێکبکەوێو ئەو شانۆییە لەگەڵ خۆیدا بگونجێ ، وەکو ئەرستۆ ئەیووت : « بۆ وێنە ئێمە پێویستە پیاوەتی پیاو باسبکەین ، نەك پیاوەتی ژن ، یان ناسکیو جوانی ژن نەك پیاو »(١) ، ئەرستۆ ئەیووتپێویستە کردەوەو قسەو ڕەوشتی ئەکتەر لەگەڵ کردەوەو قسەو ڕەوشتی ئەو کەسەدا بگونجێ کە دەورەکەی ئەبینێ .

٥ ــ دوورکەوتنەوە لە پیشاندانی کارو ڕووداوی سووڕهێنەرو ناماقووڵو کوتوپڕی بۆ گەیشتن بەکۆتایی شانۆگەرییەکە ، بەڵکو پێویستە بەڕێگایەکی ماقووڵو بەجێ وردەوردە بەرەو کۆتایی بڕۆین .

٦ ــ پەیڕەوی کردنی یاسای حەیاو ناموسو دوورکەوتنەوە لەپیشان دانی ئەو بینراوانەی کە زیانی هەیە بۆ سەر ناموس .

٧ ــ وەرگرتن لە مێژوو : پێویستە نووسەری شانۆگەری باسەکەی لە مێژووەوە وەربگرێ ، بەتایبەتی مێژووی یۆنانی ، هەرچەندە هەندێکی تریان لە مێژووی ئیسپانیو تورکەکانەوە باسەکەیان وەرئەگرت ، بەڵام زۆر بەدەگمەن .. باوەڕیش وابوو کەباسەکە پێویستە ــ بەتایبەتی لای کۆرنێ ــ لەبارەی کاروباری ووڵاتو ئایینو ( سیاسی )یەوە بێ ، نەك خۆشەویستیو دڵداری ، هەر چەندە ( کۆرنێ ) خۆی زۆر جار

(١) هونەریهۆنراوە (فن الشعر).

مەسەلەی دڵداری ئەخستە ناو شانۆییەکانیەوە بەڵام بۆئەوە بوو کە لە بەردەمی ( ئەرکو پێویستی )دا بیبەزێنێ ٠٠

لەبەر ئەوە باسەکانی شانۆگەری سەردەمی کلاسیکی زۆرتر باسی پاشاو کاربەدەستە گەورەکانی ئەکرد ، بەتایبەتی وچونکە بزانین هەرمیرو دەولەمەندو پاشاکان بوون یارمەتی شانۆیان ئەدا وپێویست بوو چیرۆك نووسەکان خۆیانیان لێنزیك بخەنەوە ٠

٨ ـ پارێزگاری‌کردنی یەك شێوە لە نووسینا ، کەئەویش شێوەی هۆنراوەیە ، ئەمەش زیاتر لاسایی‌کردنەوەی گریکەکانەو چەسپاندنی بیرو باوەڕەکانی ئەرەستۆ ، بەلکو ئەیانووت نابێ ژمارەی دێرە هۆنراوەکان لە (١٥٫٠٠٠ ) پانزە هەزار دێڕ کەمتربێ‌و لە ( ١٨٫٠٠٠ ) هەژدەهەزار زیاتربێ ، وە بەشەکانی شانۆگەرییەکەش لە (٥) پێنج بەش ـ فصل ـ نابێ کەمتر بێ ٠٠ هۆنراوەی چیرۆکی شانۆیی کلاسیکیش پێویستە سەنگ‌و قافیەیەکی تایبەتی هەبێ وە لە دوو دێڕا مانای ڕستەکە تەواوبێ ٠٠

**نووسەرەکانی شانۆی کلاسیکی:**

لە نووسەرەکانی شانۆی کلاسیکی لەفەرەنسەدا سێ‌کەسیان ناوبانگیان دەرکردوو هەتا ئێستاش جێگەیان دیارە لە مێژووی وێژەی شانۆدا ٠٠٠ ئەوانەش ( بییر کۆرنیە ١٦٠٦ــ١٦٨٤ز ) وە ( جان راسین ١٦٣٩ــ١٦٩٩ز )و ( جان باتیست بوکلان ـ مۆلیر ـ ١٦٢٢ ـ ١٦٧٣ ز ) :

**١ ـ کۆرنێ:**

کۆرنیە یەکەم کەس بوو کە بناغەی قوتابخانەی کلاسیکی داڕشت ، بەتایبەتی لە چیرۆکەکەیا ( سید ) ـ کە لەمەوپێش باسمان کرد ـ قۆناغێکی تازەی لە مێژووی شانۆی فەرەنسی هێنایە کایەوە ٠٠ کۆرنێ زۆر چیرۆکی

تراژیدی تری نووسی وەکو (پۆلیکت)و ( سینا )و ( هۆراس )و (نیکۆمید)و ( مردنی پۆمپی ) •• هتد •

لەمانەدا هەمووی لەسەر یاسای کلاسیکی ڕۆیشتو بەندەکانی چەسپاند •

**٢ ـ جان راسین:**

ئەمیش بەگەورەترین نووسەری تراژیدیای فەرەنسی ئەژمێررێ ، لەگاتێکا ئەژیا کە کۆرنێ لەو پەڕی سەرکەوتنو بەرزیّیا بوو •• یانی لە سەدەی حەڤدەهەمین ، لەکاتی ژیانی لویس چواردەهەما •• ژیانی هونەری راسین لە سالّی ( ١٦٦٤ز ) دەستپێدەکات کە شانۆگەری ( تیبایید ) پێشکەش کرد ، وتیایا لاسایی شێوەی کۆرنێی کردەوە ، راسین هەرچەندە پەیرەوی کۆرنێی ئەکرد ، بەلّام لە چیرۆکەکانیا ، بەتایبەتی ( ئەلکسەندەر )و ( ئەندرۆماك ) شێوەیەکی تایبەتی بۆ خۆی هەلّبژارد ، کە ئەویش ئەوەبوو زیاتر گوێی ئەدایە دەروونو هەست••واتە بەپێچەوانەی کورنێوە کەئەیوت پێویستە هەستو خۆشەویستی لەبەردەمی ( پێویستی )دا بتوێتەوە • بەراستی راسین بەپێچەوانەی کۆرنێ ئەجوولّایەوە بەبێ ئەوەی لە یاسای قوتابخانەی کلاسیکی بچێتە دەرەوە ، و بەبێ ئەوەی بزانێ کە هونەرێکی تراژیدی نوێ ئەهێنێتە کایەوە ، ئەمەش بەتایبەتی لە چیرۆکەکانیا ( بریتانی کۆس ) و ( میتریدات ) و ( ڤیدر ) و (ئیڤجینی)دا دەرئەکەوێ ••• ئەم تازەکردنەوەیەش ـ وەکو مامۆستا (لالسون ) ـ مامۆستای سوربون ـ ئەلّێ لە دوورێگەوە بۆیچوو :

أ ـ چیرۆکی شانۆیی ( تراژیدی ) فەرەنسی زۆر جوانترو دلّگیرتر کرد •

ب ـ لە هەمانکاتا جوانیو دلّگیریی تراژیدی یۆنانی خستە ناو شانۆگەرییەکانەوە •

باسی شانۆگەرییەکانیشی بریتی بوون لە :

أ ـ بەشی زۆری باسە مێژوویییە کۆنەکانو کەزۆر جار وێژوانەکانی

یۆنانو رۆمان باسیان کردبوو ولێی دوابوون ، وەکو (یۆریپیـــدیس‌و هۆمیرۆس‌و برجیدوتاسیدو .. هتد) .

ب ـ چەند جارێکیش باسی مێژووی تازەی ئەکرد ، وەکو هێنـــای لـــە شانۆگەری ( باجازییـــە )دا باسی مێژووی تورکیای تازەی کرد[1] ، ئەمەش بەهۆی چەند هۆیەکی سیاسی‌یەوە بو .

**۲ ـ مۆلییّر :**

هۆنەرو چیرۆك‌نووس‌و ئەکتەرو فەیلەسوفی فەرەنسی ( جان باتیســـت بوکلانـــ‌مۆلییّر) لەهەمو سەدەی حەڤدەهەمدا وەك مانگ لە ئاسمانی‌هونەرو وێژەی فەرەنسەدا ئەدرەوشایەوەو هەموو ناوەگـــــەورەکانی‌تری وەکو ( کورنیەو راسین ) هەتا لویسی چواردەهەم خۆیشی بەلادابوو .

لەبەرئەوەی مۆلییّر خۆی دەوڵەمەندبوو زیاتر لەگەڵ پاشاو میرەکاندا تێکەڵاوی ئەکردو رای ئەبوارد ، هەتا لە سالی ( ١٦٤٢ز )دا لەگەڵ لویسی چواردەهەمدا لە گەشتەکەیدا بو ( ناربورن ) بەشداربوو بەڵام سەیری‌کرد ئەمە بۆ ئەودەست نادات ، لەبەر ئەوە وازی لە کۆشك‌هێناو تیپێکی نواندنی دامەزراند ، بەهۆی ئەمەوە باوکی دەری‌کرد .. لەبەر ئەوەی کـــە مۆلییّر نەیتوانی لە ژێر ئەو قەرزە زۆرە دەربچێ لەسالی (١٦٤٥)ـــدا بەندکرا تـــا کابرایەکی قۆنتەراتچی فریای ئەکەوت‌و رزگاری کرد ... ئەمیش بـــەرەو دێهاتەکان کەوتە رێ‌و بەناوی تیپی میر (دی‌کۆنتی)یەوە دەستی‌کردبەنواندنی شانۆیی ، هەتا لەسالی (١٦٥٨)ـــدا توانی بۆ یەکەم‌جار لە بەردەمی پاشادا شانۆگەری‌یەکی پێشکەش کرد هەستی پاشای بجولێنێ‌و داوای یارمـــەتی کرد ، ئەمیش بڕیاری‌دا کە تیپەکە ناو ببرێ بەناوی تاقە براکـــــەی پاشاوەو بەرهەم لە سەر شانۆی ( بۆریۆن ) پێشکەش بکات ، کاتێکیش کە شانۆکەو تێکرا تیپەکە هاتە ناو کۆشکی پاشایی‌یەوە . ولەکاتێکدا کەبۆ جاری چوارەم شانۆگەری ( نەخۆشی بیرشێواو ـ ( الوهم )ی پێشکەش ئەکـــرد تووشـــی

---

(١) کەئەلێین(تازە)مەبەست‌کاتی ژیانی راسینە .

بەربونی خوێن ــ نزیف ــ بوو ، کاتیکیش کە لەماڵەوە مرد کەنیسە ڕێگەی ناشتنی نەدا ، بەڵام دوای گێرمەو کێشەو وتەو وێژێکی زۆر بڕیار درا کەلــە کەنیسەی ( پییر یوسف ) دا ساڵی ١٦٧٣ز بنێژرێ •



## « شــانۆی ســەدەی هەژدەهەم لــە فەرەنسەدا »



ماوەیەکی زۆر دوای مردنی نووسەری تراژیدی ( راســین ) تێپەڕی نووسەری کۆمیدی ( مۆلییر ) بێ ئەوەی یەکێك لە مەیدانا پەیدا ببێ و کەلێن پڕبکاتەوە ، هەرچەندە زۆر نووسەر دەستیانکرد بەنووســین ، بەڵام زۆر سەرکەوتوو نەبوون ، بەتایبەتی ( کریبیۆن )کە چەند شـــانۆگەری یەکی نووسی و ســـەرکەوتنێکی کاتی وەرگرت ، وەکو چیرۆکی شـــانۆیی ( رادامیست و زنوبیە )و ( سەمیر ئەمیس )و ( ئەلێکترا ) •• هتد •

بینراوەکانی ئەم شانۆگەری یانە هەرچەندە بەهێز بوون ، بەڵام تیکەڵ و پێکەڵ و ڕێك نەخراوبوون ، لەبەرئەوە بە نووسینێکی سەرکەوتوو نەمــر ناژمێررێن •••

بەم جۆرە چەند ساڵێك شانۆ لە فەرەنسەدا ڕۆییشت هەتا نووسەری بەناوبانگ ( ڤۆلتێر ) هاتــە کایەوەو بووبــە هۆی تــازەکردنەوەی ڕیڕەوی هونەرەکانی شانۆو ( کەمێك ) لەیاسای ووشــکی کلاسیکی دوور خستەوە ••• ئەمە لە کاتێکا (شکسپیر) لەئینگلتەرە گۆڕین و پێش خستنێکی تەواوی لە شانۆدا کرد بوو ، وەڕیرەوێکی تازەو ئاسانی بۆ دانابوو •• جــا

ڤۆلتێر زۆر سوودی لە بیروباوەڕەکانی شکسپیر وەرگرت ، بەتایبەتی کاتێك کەچوو بۆ لەندەن و سێ ساڵی تیا مایەوەو شانۆی ئینگلیزی ی زۆر بەجوان و

ڕێك و پێك هاتە بەرچاو ، کاتێك کە گەڕایەوە بۆ فەرەنسە دەستی‌کرد بە نووسینی چیرۆکی شانۆگەری‌و ووتارو داوای‌کرد بۆ گۆڕینی ڕێڕەوی شانۆو سوودبینین لە شکسپیر . لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هونەری ترا‌ژیدی هەر لەدواکەوتن‌و کزی‌یا بوو وشوێنێکی ئەوتۆی نەبوو کە شایانی باس‌بێ ... بۆ .. ؟!

ئێمە پێویستە دان بەوەدا بنێین کە گەلی فەرەنسە لەم سەردەمەدا ووڕی شەڕو کوشتارەکانی لویسی چواردەهەم‌و خراپی یاسای پاشایەتی‌و نزمی‌و کزی ئابووری ووڵات‌و زیادبوونی باج‌و نەمانی خووورەوشت بوو ..، کە ئەمانە بوونە هۆی بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسی لەدوا چارەکی ئەم سەدەیەدا ، بێ‌گومان هەر ئەم هۆیانەش بوون کە بوونە هۆی دوا کەوتنی شانۆگەری لە فەرەنسەدا ، بەتایبەتی کە فۆلتێریش هات‌و داوای گۆڕینی شێوەی شانۆیی کرد ، نووسەرەکان سەریان لێ‌شێوابوو کە ئایا هەر لەسەرڕێ‌و شوێنی کۆن ( کلاسیکی تقلیدی )[1] بڕۆن یان داواکانی فۆلتێر بەسەر شانۆدا بسەپێنن ..

لەم سەردەمەدا چەند نووسەرێکی تری شانۆیی هاتنە کایەوەو هەوڵیاندا بۆ نووسینی شانۆگەری کەلەسەر ڕێ‌و شوێنی کلاسیکی بڕوات بەتایبەتی ( کومبریستون‌و دانشێ‌و بوایێ .. هتد ) بەڵام دەنگ دانەوەی شانۆگەری‌یەکانیان لە ڕۆژانە زیاتر کەتیا ئەنوێنرا دەرنەئەچوو و نەئەمایەوە.

کەواتە گرنگ‌ترین‌و بەناوبانگ‌ترین نووسەری فەرەنسی ئەم‌سەر دەمە دووان بوون ( کریبیۆن‌و فۆلتێر )، وەکو ووتمان چیرۆکەکانی کریبیۆن سەرکەوتنێکی کاتی وەرئەگرت‌و لەکاتی خۆیا باس ئەکرا ، بەراستی شاعیرێکی باش ولێ‌هاتووش نەبوو ، هەرچەندە بیرو باوەڕەکانی لە فۆلتێر پێشکەوتووتر بوو .. لەبەرئەوە بە تەنیا فۆلتێر لەمەیدا ئەمێنێتەوە و ژیانی خۆی تەرخان ئەکا بۆ چیرۆکی شانۆیی وناوی فۆلتێر هەمیشە

---

(١) قوناغی کلاسیکی بەسێ پلەدا تێ‌پەڕی : کلاسیکی‌یونانی وە کلاسیکی تقلیدی وە کلاسیکی نوێ .

ئەبەسترێتەوە بە هەوڵدانە ئازایانەکەیەوە کەئەیدا بۆ لابردنی کۆتو زنجیری نالەباری یاسای شانۆی کلاسیکی ، کە لادان لەو یاسایانەو لەو کاتەدا بەکفرو تاوان ئەژمێردا ...



## « شانۆی ئینگلتەرە لەسەدەی شـانزەهەمەوە »



لەم ماوەیەدا هەندێ شانۆ دروست بوو، هەندێ نووسەرو شانۆگەر هاتنەکایەوە کە هەوڵێکی بێشوومارياندا بۆ پـەیـدا بوونی جمو جوولی شانۆیی ، لەبەینی ئەم شانۆیانەدا بەربەرەکانی یەکی بەهێز دەستی پێ‌کرد ، هـەرلایەك ئەیویست باشترین نووسـەرو ئەکتـەر بۆ لایخۆی ڕاکێشێو چیرۆکەکۆنەکانیان پێ زیندوو بکاتەوەو لە قاڵبێکی تازەدا پیشانی بـدات ، لەدوادوایی سەدەی شانزەهەما کۆمەڵێك لەنووسەرانی شانۆیی هاتنەکایەوە کە ناوبان لە خۆیان نا ( تێگەیشتووە دانیشگایی‌یەکان ) چونکە بەشـی زۆربان لە دانیشگای ( کامبـرجو ئۆکسفۆرد ) دەرچووبوون ، ئەمـانە دەستیان کرد بەنووسینی چیرۆك بۆ شـانۆکان .. هەندێ چیرۆك لـە کۆنەکانەوە وەر گیرا بوونو هەندێکی تریشی لە دانانی خۆیان بوو،هەموویان هەوڵی ئەوەیان ئەدا کە شێوەی شانۆی کۆن لە مێشکی خەڵکا بچەسپێننو ئەو خوێندنەی لەدانیشگاکان خوێندوویانە لەوێژەی کۆنو وێژەی شانۆیی لە شانۆگەری‌یەکانا دەری‌بخەن ، زۆر شانۆگەری‌یان پێشکەش‌کرد لە نێوانی ( کارەسات )و پێکەنیناوی ( کۆمێدی )دا بوون کەئەمەش بەڕێگەیەکی تازە ئەژمێررا لە مەیدانی هونەری شانۆیی‌دا .

بەناوبانگ‌ترینی ئـەم تێگەیشـتوانە ( مـارلۆو گـرینو لودجو توماس کید ... هتد ) بوون . .

بەمـانە ڕێگەی شـانۆ خۆش‌کرا بۆ گەورەترین شانۆیی سەر زەمین ( ولیام جۆن شکسپیر ) ...

# شـــكسپير

هۆنەری هەرە گەورەو بەناوبانگی ئینگلیز ( ولیام جۆن شـــکسپیر ) لەرۆژی٢٣/٤/١٥٦٤ لەشاری ستراتفۆرد لەدایك بووەو هەر لە قوتابخانەی ئەوێ فێری وێژەی ( لاتینی ) بووە ، لە (١٥٨٢) کیژۆلە ( ئـان هانوی )ی مارەکرد کە کچی جووتیارێکی دەوڵەمەند بوو ، پاش ماوەیەك سێ منالّیان بوو ( سۆزانا )و ( دووانەیەك کە کوڕێكو کچێك بوونو ناویان هـاملتو جودیث ) بوو .

ژیانی منالّیی شکسپیر لە مێژوو نادیارو شارراوەیە ، تەنیـا ئەوەندە ئەزانین کە لە پانزە سالیدا لەگەڵ هەندێ لاوی سەرکێشو سـەرەڕۆدا هاوڕێیەتی ئەکردو سەرگەرمی پالّی پێوەنان کە بەدزییەوە بچنـە نـاو بـاخێ (سێر تۆماس لوس)وە ئاسکـەکانی بدزن ، بەلاّم شکسپیر لەناو ئەوانەدا ئەبێ کە ئەگیرێنو لەدادگا تووشی چەرمەسەریو ئەندێشە ئەبێ، ئەویش ناکاتە نامەردی هۆنراوەیەکی دوور ودرێژ ئەهۆنێتەوە کە هەمووی جنێوو قسەی ناشیرین ئەبێ بو(سێر تۆماس) ، ئەمیش زۆر رقی لێ‌هەڵ ئەستێو هەڕەشەیەکی تونـدی لێ‌ئەکا ، شکسپیر لە ترسا بۆ(لەنـدەن) ڕائەکاو لەوێ ڕێگەی شانۆ ئەگرێتە بەر، یەکەم ئیشی ئەوەبوو کە لغاوی ئەو وولاخانەی ئەگرت کە خەلکی پێی ئەهاتن بۆ بینینی شانۆگەرییەکانو خزمەتو ئاگاداری وولاخەکانی ئەکرد هەتا ئاهەنگ تەواو ئەبوو، ئینجا بووبە یارمەت دەری ئەکتەرەکانو کاتی دەورەکانیانی پێ ڕائەگـەیاندن ، زۆری پێ‌نەچوو بووە ئەکتەرو لە دواییدا گەورەترین نووسەری شانۆگەری جیهانی.

وە لەسالّی ( ١٦١٢ )دا گەڕایەوە شارەکەی خۆیو هەتا چوار سـاڵ لەوێ دانیشت ، لە ٢٣ــ٤ــ١٦١٦دا کە ڕۆژی لە دایك بوونیەتی هەر لەوێ گیانی سپاردو نێژرا ...

ئێمە لێرەدا نامانەوێ زۆر لە ژیانی شکسپیر خۆی بکۆلینەوەو خۆمانی پێوە خەریك بکەین ، تەنیا ئەوەی پێویستە بیزانین ژیانی وێژەییەتی کـە ئەتوانین بیکەین بە چوار بەشەوە : ــ

**بەشی یەکەم : ـ لەسالی ١٥٨٨ ـ ١٥٩٤ :**

ئەو چیرۆکە شانۆیی‌یانەی لەم قۆناغەدا نووسی هەمووی پوختەکردنو گۆڕینی چیرۆکە کۆنەکانە ، بێ گومان لێرەدا لە هەرەتی لاوی‌یەتیا ، لەبەر ئەوە زیاتر خووی‌دایە ووشەی جوانو پرشنگ‌دارو شانۆگەری‌یە (کومیدی) یەکانیشی پڕبوون لە قسەی‌خۆش‌و پێکەنین ...

لەم قۆناغەدا زۆر هەوڵی‌دا کە خۆی لە گیرمەو کێشەی هۆنراوەی کۆن ـ بەتایبەتی ( قافیە ) ـ دوور بخاتەوە ، ئەو هۆنراوانە نەبێ کە بۆ گۆرانی‌ی دائەنان لە شانۆگەری‌یەکەدا .. گرنگ‌ترین شانۆیی ئەم سەردەمەی ئەمانە بوون :

أ ـ تیتۆس ئەندرۆکس .
ب ـ کۆششی دڵداری‌ی وون‌بوو ـ کە گومان ئەکرێ ئەمەیان هی خۆی بێ .
ج ـ هەڵەکان .
د ـ خەوبینینی شەوێك لە ناوەڕاستی هاوینا .
هـ ـ رۆمیۆو جولێیت .
و ـ دوو گەورەپیاو لە ڤیروناوە .
ز ـ هنری شەشەم .
ح ـ ریتشاردی دووەم .
ط ـ ریتشاردی سێیەم .
ی ـ دوو قەسیدەی درێژ بەناوی (ڤینۆس‌و ئەدۆنیس)و (لۆگریس)ەوە.

**بەشی دووەم : ـ لەسالی ١٥٩٥ ـ ١٦٠١ :**

لەم قۆناغەدا چەرخی ڕاپەڕین لە هەموو ئەورووپاداو بەتایبەتی لە ئینگلتەرەدا دەستی پێ‌کردبوو و هەستی مرۆڤ نەی ئەجۆشا ، دوای ئەوەی کە کەشتی‌یەکانی ئیسپانیا نقووم‌کران لەکاتی شاژن ئەلیزابێث‌دا بۆ سەر ئینگلتەرە هاتبون تا داگیری بکەن .. بۆیە زمان دەستی‌کرد بە دەربڕینی هەستی خۆی بەهۆی شانۆگەری‌یە مێژوویی یەکانەوە ، بەتایبەتی (پاشاجۆن‌و

هینری چوارەم‌و هینری پێنجەم‌و هینری هەشتەم) لەم قۆناغەدا زیاتر بەلای شانۆگەری پێکەنیناوی‌دا ئەچوو ، بەڵکو چیرۆکە مێژوویی‌یەکانیشی هەندێ بینراوی پێکەنینی تێ ئەخست ، گرنگ‌ترین چیرۆکی ( کۆمیدی ) ئەم سەردەمەی ئەمانەبوون :

أ ــ ژنە شادمانەکانی ویندسور •

ب ــ ڕاهینانی پڵنگ •

ج ــ بازرگانی ڤینیسیا •

د ــ چەقەچەقی بێ هاڕین •

هـ ــ هەرچۆنێ حەز ئەکەی •

و ــ شەوی دوانزەهەم •

ز ــ ئەوەی دوایی‌یەکەی باش‌بێ •• باشە •

ح ــ دوو پارچە هۆنراوەی جوان کەزیاتر لە (١٢٦) دێڕ ئەبێ ، کە تیایا گلەیی لە هاوڕێیەکی خۆی ئەکات کە دۆستەکەی داگیر کردووە•

**٣ ــ بەشی سێیەم : لەسالی ١٦٠١ ــ ١٦٠٧ :**

لەم ماوەیەی ژیانیدا شکسپیر هەرچی خۆشی‌و کامەرانی هەیە لە دڵیانەبوو ستەم‌و ئازارو ئەندێشەی ژیان وای لێ‌کرد کە ڕۆژانی ژیانی هەمووی تاریکی‌و شەوەزەنگ‌و نائومێدی بێ ، لەبەر ئەوە ئەی‌بینین کە هەتا لە شانۆگەری‌یە پێکەنیناوی‌یەکانیشیا پەردەیەکی ڕەشی خەفەت‌باری‌ی بەسەرا کێشراوەو ئەو تامەی نی‌یە کە مرۆڤ کامەران‌و دڵخوش بکات ، گرنگ‌ترینی نووسراوەکانی ئەم سەردەمەی لە شانۆگەری کۆمیدی‌دا ئەمانەن :

أ ــ حەق بە حەق•　　　　ب ــ ترۆبنس‌و کریسدا •

بەڵام وەکو ووتمان شکسپیر لەم سەردەمەی ژیانیا لە تاریکی‌و نائومێدی زیاتر هیچی بەدی نەئەکرد ، بەتایبەتی لە ژیانی خێزانی‌دا خەفەت‌و ئازارێکی زۆر سواری سەرشانی بوو بوو بەهۆی نالەباری ژنەکەیەوە ، هەر لەم ماوەیەشدا تاقە کوڕەکەی ( هاملت ) ئەمرێ •••

لەبەر ئەمـــانە هـــەمووی ئەو شانۆگەری‌یانەی لەم ماوەیەدا نووسی جوان‌ترین‌و بەنرخ‌ترین شانۆگەری خەفەتباری‌یە ( مەرگەسات ) کە ئەمانەن :

أ ــ عوتەیل
ب ــ ماکبیس
ج ــ شالیر
د ــ هاملت
هـ ــ یۆلیۆسی قەیسەر
و ــ تیمۆنی ئەسینی
ز ــ ئەنتۆنیۆو کلیوباترە
ح ــ کۆریۆلانۆس

بەهۆی ئەم چیرۆکانەوە شکسپیر زیاتر لە دەروون‌و هەستی برینداری خۆی ئەدواو ئەشکەنجەی خۆی‌پێ تەخت ئەکرد •

**٤ ــ بەشی چوارەم : لەسالی ١٦٠٨ ــ ١٦١٣ :**

بەشێوەیەکی سەیرو سەر سوورهێنەر شکسپیر لەم سەردەمەی ژیانیـــا سەیرکردنی بۆ ژیان ئەگۆڕرێ‌و لە خەفەت‌و ئێش‌و ئازارەوە خۆی فڕێ ئەداتە باوەشی هێمنی‌و ئاشتی‌و خوشی‌و پێکەنینەوەو ژیان سەرتاپا لەبەرچـــاوی رووناك ئەبێتەوەو باشترین شانۆگەری پێکەنیناوی ئەنوسێ‌و تیایانە زیاتـــر هەوڵ‌ئەدا بۆ یەك‌خستنەوەو بەیەك گەیاندنی دوو خۆشەویستی لێك دابڕاو ، دوژمن لەناحەزی خۆش ئەبێ ، گوناە بار لە گوناهەکەی ئەبێتەوە ، ژن‌و مێرد دوای شەڕو ئاژاوە ئاشت ئەبنەوەو منال داوای لێ‌بووردن لـــە بـــاوکی ئەکات ••• جوان‌ترین چیرۆکە شانۆیی‌یەکانی ئەم سەردەمەی ئەمانەن :

أ ــ برکلیس میری‌سوور •
ب ــ چیرۆکی زستان •
ج ــ سامبلین •
د ــ گەردەلوول •

لەدوادوایی ژیانی وێژەیی‌دا چیرۆکێکی شانۆیی مێژوویی‌تری نووسی لە بابەت ( هینری هەشتەم )ەوە •



ئەمە بەکورتی سەیرکردنێکی سەرپێییبوو بۆ ئەو شـــانۆ نرخ دارو پیرۆزەی کە شکسپیر ڕێڕەوو بناغەی بۆ داڕشت لە جیهانی وێژەدا٠٠ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئەوەیە کە شکسپیر ناوەرۆکی هەموو ئەم شانۆگەرییانەی ( بیرەکەی ) لە وێژەو وێژەوانەکانی ترەوە وەرگرت ، تەنیا دوو شانۆگەری نەبێ ( کۆششی دلداریی وون بوو ، وە گەردەلوول ) کە هیچ بەلگەیەك تائێستا دەرنەکەوتووە ئەم دوانەشی وەرگرتبێ ٠٠

گرنگترینی ئەو سەرچاوانەی کە شانۆگەرییەکانی لێوەرئەگرت :

أ ــ هەندێکی لە هۆنراوەو گۆرانیو چیرۆکە کۆنەکان وەرگرت ٠

ب ــ هەندێکی تری لە نووسراوو کتێبە مێژووییەکان ٠

ج ــ گرنگترین سەرچاوەی شانۆگەرییەکانی کتێبی ( ژیانی پیـــاوە گەورەکان ) بوو کە ( پلۆتارك ) نووسیبووی ، لەکاتی شـــاژن ( ئەلیزابیث )دا وەرگێڕرابووە سەر ئینگلیزی ٠٠

بێگومان شکسپیر پایەیەکی وا بەرزی گرت کە بێسلەمینەوە ئەتوانین بە ( هۆنەری جیهانی ) ناوبەرین ، چونکە بەڕاستی شـــکسپیر زۆر لەوە گەورەترو نـرخدارترە کە یـەك گـەڵ یـان تەنیـا نەتەوەیـەك کەڵـکی لێوەربگرێ ٠٠٠ جارێکیان لە قوتابییەکی یابانی ئەپرسن : « ئایا ئەتوانی هەست بەدەروونی پاڵەوانی شانۆگەرییەکانی شـــکسپیر بکـەیت ٠٠؟ » لەوەلاما ووتی : « بێگومان ٠٠ چونکە هەموویان یابانین » ٠



لەســـەردەمی ژیانی شـکسپیردا چەند نووسەرێکی مەزنی تریش پەیدابوونو هاوکارییەکی تەواویانکرد لە دامەزراندنی شانۆی ئینگلیزیدا، کە بەناوبانگەکانیان ( بین جۆنسونو توماس دیکەرو جۆنهایوودو جورج چاپمـــان ٠٠ ) بوون ، کـــە ئەمانە هـــەندێکیان زۆر کۆششیانکرد بـــۆ رزگاربوون لە کۆتو زنجیری یاسای شانۆی کلاسیکی ، هـــەندیکی تریان وەکو ( بین جونسون ) خۆیان بۆ رزگار نەکراو لە یاساکانی دەرنەچوون ٠٠

## « شـــانۆی نوێ »



وێژەی شانۆیی تازە ، وێژەی سەر لووتکەی شاخ‌و بەرزفڕین نی‌یە ، بەڵکو لەراستی‌یا وێژەی ناوشیوو قوڵایی‌و نزمی‌یە ، ئەم وێژە تازەیە هەموو هێزو بەنرخی‌و هۆی پەرەپێدانی لەو نزمی‌و چاڵو چۆڵی‌یانەوە وەرئەگرێ‌و پێی بەرز ئەبێتەوە ، چونکە مرۆڤایەتی‌و هەستی پاك‌و بێ‌گەرد زیاتر لـــەم پلە نزمانەدا ئەبینرێ •• شانۆش لەپێش هەموو شـــتێکا پێویستە گیانی مرۆڤایەتی تێدا بێت و یارمەتی مرۆڤ بـــدات بۆ لەیەك گەیشتنی باشـــترو بەزەیی کۆمەڵایەتی قوول‌ترو لێبوردنێکی فراوان لە هەموو بارێکی ژیانەوە هەڵخات••وەکو نووسەری مەزن (ئارسەر هۆبکنز) کە بەڕاگری کۆلەکەی شانۆی تازەی لەئەمەریکا ئەژمێررێ ئەڵێ •

ئەتوانین مێژووی شانۆی رۆژئاوایی بکەین بە (٤) بەشەوە :

أ ـــ ماوەی ئەسینی لەسەدەی پێنجی پێش زایینەوە •

ب ـــ ماوەی ئەلیزابیسی •

ج ـــ شانۆ لەسەدەی حەڤدەهەمەوە •

د ـــ ماوەی دوای سەدەی حەڤدەهەم ، کە بەگەورەترین مـــاوەی مێژووی شانۆیی ئەژمێررێ ، هەتا ئێستاش بەردەوامەو مەبەستی ئەم باسەمانە •

شانۆی تازە قۆناغێکی زۆر فراوان‌ترو ماوەی زیاترە لە هەمووماوەکانی تر ، چونکە وەکو ئەزانین شانۆگەری‌یەکانی ئیغریق بەرهەمی چەندکەسێکی دیارو ئاشکرا بوون لەیەك شاردا (ئەسینا)، لەسەردەمی ڕاپەڕیندا بەرهەمێکی ئینگلیزی بوو بە شێوەیەکی گشتی • کلاسیکیش بەرهەمی تەنیـــا سێ‌کەسی فەرەنسی بوو لە کاتی‌لویسی چواردەهەما • بەڵام شانۆگەری تازە لەهەموو ئەوروپاو ئەمەریکاوە هێرشی هێناو چەســـپاو بەهەموو جیهانا بەخێرایی بڵاوبووەوەو جێگیربوو •

ئەم شەپۆلە تازەیە دوای هەوڵو کۆششێکی زۆر لە فەرەنسەدا (هینریَ بیكو فرانسوادی کوریلو یۆجین بریۆ ) لەسەروو هەموویانەوە ( ئەمیل زۆلا ) هێنایانە کایەوەو لە ئەسکەندناڤیا بەدەستی ( هنریك ئەبسنو سترنبرگ )بوو بە هۆیەکی ڕێكکردنەوەی هەڵەی کۆمەڵایەتیو شیتال کردنەوەی ژیانی مرۆڤ،لەئەڵمانیا (جیرارد هۆپتمان) لە روسیا (لێون تۆلستویَوچیکوفو مەکسیم گۆرکی)بەکاریان هێنا، هەروەها لەئەمەریکای خواروو دەستکرا بە کارهێنانی لە لایەن (جاسنتوبنڤنتی)و ئیسپانیو ئیتالیەکانیترەوە ، لەدواییدا لە ئینگلتەرەو ئیرلەندەو ئەمەریکا شدا .

بیگومان باسەکانی ئەم شانۆگەرییانە لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر گۆڕراو شێوەیەکی تایبەتی وەرگرت ... بۆ وێنە لە فەرەنسەدا شێوەی ووردبینیو لە رووسیادا مرۆڤایەتیو لەئەمەریکا هێزو بازوو ، لەئینگلتەرە جمو جوولیبیرو مێشك...یانی ئەم جۆرە شانۆییانە زیاتر لەم باسانە ئەدوان کە باسمانکرد ، هەروەها بیرمان نەچێ کە ئەم شانۆیە بەپێی بیرو باوەڕو توانای نووسەرەکانی ئەم وولاتانە ئەگۆڕرا ، بۆ وێنە(هینری بیكو گۆرگیو شوو ئۆکیسیو ئونیلو ئەبسنو بیراندیللوو لورکاو تینیسی ویلیامزو ئارسەر میلەر...)وە زۆرانیتر .



□
## « قوتابخانه تـازەكانی شــانۆ »
□

وێژەی شانۆ بەپێی چۆنیەت‌و ڕێبازی كۆمەڵایەتی ـ بەتایبەتی‌باری سیاسی ـ لەگەڵ گۆڕانی كۆمەڵا لەبەرگ گۆڕینا بووە ، چونكە هــەر لــە كۆنەوە تا ئەمڕۆ شانۆ باشترین ئامێرو هۆ بووە ووریاكردنەوەی خەڵكی‌و پێش ڕەوی كردنیان بەرەو ژیانێكی باشترو ئاسوودەتر ، بەڵام ( شــێوەی ) پێشكەش كردنی ئــەم خزمــەتــە گەورەیە بـــەو كۆمــەڵەو ( جۆری ) پێشڕەوی‌كردنی لە گۆڕان‌و پەرەپێــدانا بوو •• واتە شــانۆ لە ناوەرۆكدا هەمووی یەك‌بوو ـ خزمەتی گەل‌و هوشیاركردنەوەی ـ ، بەڵام لە شێوەدا لە گۆڕانا بوو ، لەبەر ئەوە زۆر جۆر ڕێبازو قوتابخانەی شانۆیی هــاتە كایەوە كە هەتا ئێستاش ئەم قوتابخانانە بەردەوامن لە پێ‌گەیاندن‌و ڕوونــاك كردنەوەی مێشكی مرۆڤایەتی••

ئەمەبوو ـ وەكو باسمان كرد ــ لە پێشەوە هیچ بایــەخ نەئەدرا بــا هونەری شانۆ ، شانۆگەریش تەنیا بریتی‌بوو لە لاسایی‌كردنەوەو پیشاندانی سەردەمێكی مێژوویی‌و بەشانوباهو هەڵدان بەخواوەنــدو پاڵەوانــەكاناو هیچی‌تر ، هەتا سەردەمی شانۆی كلاسیكی كە وەكو ووتمان سێ نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی نەخشەیان بۆ كێشاو بناغەیان بۆ داڕشت ، دوای ئەمانە قوتابخانەی ڕیالیستی (Rialism) ــ لەسەردەستی ئەمیل زۆلا وگۆركی‌و ئەبســن جێگربــوو،ئینجــا قوتابخــانەی ســروشتی ـ (Naturalism) لەڕوودراوە سەری هەڵدا كە بریتی‌یە لە ڕێڕەوی ڕوودراو بەشــێوەیەكی زۆر قووڵ وخنكێنراوی (ریــالیستی)•••ڕێبازی(رەمــزی)یش تێكــەڵ بەسروشتی بوو ئەوەی ئەو بیروباوەڕەی كە ئەیــان‌و یــست بە خــەڵكی بگەیەنن‌و لەبەر چەند هۆیەكی ئەو سەردەمە نەیان‌ئەتوانی ڕاستەو خۆ دەری ببڕن رەمزێك یان نیشانێكیان دائەنا كەمانای ئەومەبەســـتە بگەیەنێ •• ئەتوانین بلێین كە قوتابخانەكانی تری دوای ئەم سەردەمــانە بریتین لەم

مەبەستەــدەربڕینی هەستو مەبەست بــەهۆی ڕێگەیەکی نادیــارەوەــ، لەوانەش (تەعبیری، سیریالی ، لا معقول ــ کەلەسەر دەستی مارتین ئایسلاندو بۆجین یۆنسکۆ دا پەرەی ســـــەندو پێ‌گەیی‌ــو شانۆی مەلحەمی لەژێـــر چاودێری‌برتۆلد برێختی ئەڵمانی‌دا•••)هەروەها گەورەتــرین قوتابخــانەی شانۆیی کەپێی ئەڵێن(پێشڕەو)کەلە پەنجاکانــەو دەســت پێ‌ئەکاتو زۆر بەجوانی ئاڵۆزاوی کۆمەڵ لەپاش شەڕی جیهانی دووەم پیشــان ئــەداتو شیتالی ئەکاتەوە،ئەمەش لە (لامعقول)ەوە دەست پێ‌ئەکات هەتا ئەگاتــە (عەبەسی)کە لەسەر دەستی گیرکارد لە فەرەنسە دەستی پێ‌کردو فەیلەسووفە (وجودی)یەکان پەرەیان پێ‌دا،وەکو(سارتەرو کامو•••هتد)دوای ئەمــان پیتەرڤایس شانۆی تۆماری(تسجیلی)هاوردە کایەوە کە وێنەی ڕووداوەکانی جیهان ئەخاتە بەرچاو ، وەکو باس‌کردنی مەســەلەی ڤێتنــامو کەمبۆدیاو خوارووی ئەفەریقاو فەلەستینو زۆر شتی تری‌وا ••

لە ساڵەکانی پەنجــا بــەدواوە شــانۆی ســەربەســت یانزینــدوو بڵاوبووەوە،هەروەها شانــۆی دڵڕەقی(القسوة)، ئینجــا شــانۆی رەنگاو ڕەنگەکانــبەتایبەتی پێســترەشــەکان (الزنــوج)ــ کە باشترین چــەکی کاریگەری دەستی ئەم بەشە مرۆڤانەی جیهانو هەوڵدانیان بۆ وەدیهێنانی ژیانی ئاسوودەیی‌و مافی خوراویان ئەخاتە ڕوو ، کە ئەمەیان لەپاش ســاڵی (١٩٦٣)وەــپەیدا بوو • ئەم هەموو قوتابخانە شانۆیی‌یانەی کە لەم دواییەدا باسمان‌کرد ــوەکو ووتمان ــ ئاوێنەیەکی باڵانمابوو بۆ پیشان‌دانی باری ئاڵۆزاوی کۆمەڵی جیهانی لە پاش دووەم شەڕی جیهانی کە هیچ نرخێك لەناو کۆمەڵا نەماو ماف پێ‌شێل‌کراو ئیمپریالیزم دەستی چەپەڵی کێشا بەسەر زۆر لای جیهاناو دەستی‌کرد بە ڕووت‌کردنەوەو زەوت‌کردنی مافی گەلان ، بەڵام شــانۆ بیروبــاوەڕی مــرۆڤــایەتی کاری تێ‌کردو هــەوڵی‌دا بــۆ ڕوون‌کردنەوەی بیرو باوەڕو مێشکی خەلکی‌و سەلماندی کە (لەو شوێنەی پەین زۆر بێ گوڵی جوان ئەگەشێتەوە)•



□

## « پیشـەکی‌یەکی پێویسـت »

□

لە مێژووی شانۆی کوردەواری‌یا ـ بەتایبەتی سەردمی دەسـتپێ کردنی ـ تەم‌و مژو ئالۆزاوی‌یەکی ئەبینراو بەتەواوی سەرەتای لەدایك بووی ئەم هونەرە بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك نەئەزانرا ، لەبەرئەوە بە پێویستی‌یەکی پیرۆزی سەر شانم زانی کە هـەموو توانـایەکم تەرخـان بکـەم بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم‌مەبەستە ، پەتایبەتی کە هەندێ لە برایان دانیان بەوەدا نا کە هونەری شانۆگەری کوردی هەر نەبووەو نیە ، وە کورد لە مێژوودا هونەری نەزانیوەو توانای دەربڕینی هـەستی دەروونی خۆی نەبـووە ، وئەوانەی کە بەبازووی باوەڕو هێزی کوردایەتی بناغەی هونەری شانویی‌یان بۆمان داڕشت‌و ،لەناو مالان‌و سەرسەکۆو لەبەر ڕوونـاکی چرا تـوانای هونەری خۆیان پیشانی خەلکی ئەوسا ئەدا ــوەکو لەمەوپاش باسی ئەکەین ـ شایانی ڕێز وخۆشەویستیمان نین‌و شتێکی ئەوتۆیان نەکردووە کە شـایانی شانازی‌و سوپاسمان بن. ئەم نووسینە وەلامە بۆیان..

لە باسەکەما ناوی هەندێ بەڕێزان لە پێشڕەوەکانی شانۆی کوردی هاتووە کەبەو پەڕێ ڕێزو خۆشەویستی‌یەوە سەیریان ئەکـەم‌و هەمـوو هونەری شانۆی کوردی بە منەت باریان ئەزانم ـ بەتایبـەتی خوشـــکە سەربەرزو دلسۆزەکان ـ هیوادارم کە هەربەو چـاوەوە سـەیر بکرێن‌و کەس‌و کارو ناسیاویان لێم زویر نەبن ، چونکە ئێمـە تەنیـامەبەستمـان لێکولینەوەو ڕوونکردنەوەیەکی مێژوویی‌و هونەری‌یەو هیچی‌تر.

هەروەها لە باسەکەدا نەم‌توانی ناوی ئەو هەموو شـانۆگەری‌یانـە بنووسم کە لەسەرەتای مێژووی هونەری شانۆیی کوردی‌یەوە هەتا ئیمڕۆ لە هەموو کەل‌و قوژبنێکی شارەکانی کوردستانا پیشان‌دراوە، چونکە من لەو باوەڕەدام کە ئەمە هەرگیز لە توانادا نیە ..ئەگەر لە تواناشا بێ باسێکی‌و وشك‌و بێ‌تام‌و ناپێویست دەرئەچێ‌و لەتـام‌و بۆنی نووسینەکەمـان کەم ئەکاتەوە ، لەبەرئەوە لەم لایەنەشەوە داوای لێبوردن ئەکەم.

بۆ ئەم باسە پەیوەندیم بە زۆر کەسەوە کرد کە وەکو ووتم هەتا دواهەناسەی ژیانم منەت باریانم‌و واهەست ئەکەم کە ووشەی(سوپاس) مل کەچ بێ لەبەردەمیانا ، بەلاّم حەز ئەکەم کە بشلێم هەندێ لەو بەڕێزانەی ئەچووم بۆ لایان دەستیان ئەنا بەڕوومەوەو دەرگایان لی‌نەئەکردمەوە، یان بە ناشیرینی وەلاّمیان ئەدامەوەو بەلکو تا ڕادەیەکیش هەندێکیان ئەچوون بەگژ دەمماو شەڕیان لێ ئەباری ... من هەرچەندە ڕیزیان ئەگرم‌و لێشیان زویر نیم‌و ناویشیان ناهێنم ، بەلاّم ئەلێم خۆزگە تۆزێ چیکلدانەیان فراوان تر بوایە ...، ئەوەی شایانی باسە لێرەدا هەندێ لەو بەڕێزانە ئەوکـردەوە شانۆیی‌یانەی کاتی خۆی پێی هەلسابوو، لەبەر تەنگ‌و چەلەمەی ژیـان لە بیری چووبووەوە،جا کەباسم بۆ ئەکرد ئینجـا تـەلی بیرەوەری ڕۆژانی ئاســودەی ڕابووردووی دەنگی ئەدایــەوەو زۆریشی پێ‌خۆش بوو ...

نەبوونی (سەرچاوە) بۆ ئەم باسە گەورەترین کۆسپ‌بوو لەبەردەمما، کە ئەمەش لەلایەوە مایەی داخ‌و خەفەتم بوو ، چونکە لاوە ڕۆشنبیرەکانمان تا ئێستا هیچیان لەو بارەیەوە نەنووسیوەو بیرەوەری خۆیان تۆمار نەکردووە، یادداشتەکــەی مامۆستـایــان رەفیق چـالاك‌و نوری وەشتی نــەبێ لــە ڕۆژنامەی(برایەتی)دا کە کەمێك سوودم لێ‌وەرگرتن... لە لایەکی تریشەوە باشترین هاندەرم بوو بۆ ئەوەی دەست بەڕووی خۆمەوە بنێم‌و زۆرترین کەس لەو بەڕێزانە ببیم کە بیرەوەری‌یان هەیــە لەم بارەیەوە کە واتــە ئەمە یەکەم باسە لەبارەی ڕوونکردنەوەی مێژووی شانۆی کوردی‌یەوە، سەرەتای هەموو ئیشێکیش بێ کەم‌کووڕی نابێ، نامەوی لێرەدا پاکانە بۆ خۆم بکەم‌و داوای لێبووردن بکەم ، بەلکو ئەلێم پێویستم بە یارمەتی هەموولایەکە بۆ گەیشتن بە ( ڕاستی )وە چەپلەش بەدەستێك لێ نادرێ .

ڕووداوەکان‌و کارە هونەری‌یەکان بەپێی کات‌و قۆناغ ناویان هاتووەو باس‌کراون ئەمەش زیاتر بۆ ئەوەی کە ئەلقەی بیرو لێك‌دانەوەمان نەپچڕێ‌و زیاتر بچینە ناو باسەکەوە . دەفەرموون ئەمەش زادەی بیروو هەولّدانمە ..

ــ تەنیـا ــ

٢٧ــ٢ــ١٩٧٦

«سـلێمانی»

بۆ ئەم باسە سوودو یارمەتیم لەم ماموستا وبەڕێزانە وەر گرتووە کـە هەمیشە شوێنی ڕێزو شانازیو سوپاسمن:ـ

١ ـ یەحیا ئەفەندی وێنەگر.
٢ ـ نووری بەدەوی .
٣ ـ ئەحمەد سالار.
٤ ـ چیرۆکی شانویی (فالچی) حەمەکەریم ڕەمەزان هەورامی.
٥ ـ فؤاد رشید بکر.
٦ ـ صالح دیلان.
٧ ـ نەجات عەبدە.
٨ ـ فایەق چالاك.
٩ ـ حاجی علی جاسوس.
١٠ـ أ.ب. هەوری. (ڕوژی٨/٤/١٩٧٩ ئەمری خوای کرد)
١١ـ کامەران موکری.
١٢ـ ناهیدە شێخ سەلام.
١٣ـ بەدیعە دارتاش.
١٤ـ مەحموود توفیق.
١٥ـ حاجی مەلا ئەسعەدی مەحوی.(ڕوژی٢٤/٤/١٩٧٦ ئەمری خوای کرد).
١٦ـ نوری وەشتی.
١٧ـ مەجید فەتاح حاجی سەعید.
١٨ـ کەریم کابان.
١٩ـ یادداشتەکەی ڕەفیق حیلمی .
٢٠ـ علی فتاح.
٢١ـ رشید کریم (مانگی ئاب/١٩٧٦ئەمری خوای کرد).
٢٢ـ شێخ نووری شێخ مارف.
٢٣ـ عومەری نەعمان.

٢٤ــ محموود ئەحمەد (قۆنتەراتچی) •
٢٥ــ پشکۆ سەعید ناکام•
٢٦ــ نەوزاد مەجید•
٢٧ــ مەلا مەحموود کزەڵ•
٢٨ــ عبدالقادر بابان•
٢٩ــ شاکر فەتاح•
٣٠ــ ئیسماعیل حەقی شاوەیس (ڕۆژی ١٢/٥/١٩٧٦ئەمری خوای‌کرد)
٣١ــ ئەحمەد خواجە•
٣٢ــ ئەورەحمانی وەستا گورون•
٣٣ــ گەشتەکەی میستەر ریچ بۆ کوردستان سالی ١٩٢٠•
٣٤ــ قادر کابان•
٣٥ــ ڕۆژنامەی ژیان ژ٢٦و ٢٧و ٧٦ سالی(٢)و ٢سالی(١)



## ١٥

هونەری شانۆییمان ــ وەك شانۆی هەموو میللەتێکی‌تری ڕۆژهەڵات ــهونەرێکی خۆماڵی‌و ڕەسەن نی‌یە ، بەڵکو ئــەم هونەرەمــەزنەمــان لە میللەتەکانی ترەوە پێ‌گەیشتوە ، بەتایبەتی لە ئەدەبی عەرەبی وتورکی‌یەوە، لەلای عەرەب سەرەتای ناسینی ئەم هونــەرە ئەگەڕێتــەوە بۆ ســاڵەکانی ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمی زایینی ، کاتێك کە لە سەردەستی(مارون نەقاش) لوبنان دەستی پێ‌کــردو ، توای بنــاغەی شــانۆیەکی عەرەبی بە نەقاش) لە لوبنان دەستی پێ‌کردو ، توای بنــاغەی شانۆیەکی عەرەبی بــە شێوەیەکی ڕێك‌و پێك‌و تازە دابمــەزرێنێ ، ئــەوەبو لەســاڵی ١٨٤٨دا شانۆگەری (پیسکە)ــی نووسی‌و هەرخۆی ئــاوازی بۆ دانــاو لەپێنج بەشداو بەشێــوەی ئوپەرێــت لە(سەیــدا) پیشــانی‌دا، دوای ئــەوەشی شانۆگەری(هاروونە ڕەشید)ی پێشکەشی کرد.

لەعیراقیشا شانۆگەری لە سالی.١٨٨٠دا لەموسڵ لەسەر دەستی قەشە دۆمەنیکانی‌یەکان سەری هەڵداو یەکەم شــانۆگەری خۆمــاڵی (عیراقی) بەناوی(لەتین‌و خوشابا)وەبو ،کە(نعوم فتح‌الله سەحار) نووسیبووی ،کەهەر

لەموسلیش پێشکەشی کرا ، هەرکەچی مامۆستا ( ئەحمەد فەیاز مەفرەجی ) ئەڵێ کەئەم چیرۆکە لە سالی ( ١٨٨٣ )دا پیشان دراوە •

ڕەنگە لێرەدا پرسیار لە وە بکرێ کە لە عیراقا ئــەم هونەرە هەربووەو لەپێش ئەم مێژووە دا بینراوە ، بەڵام ئێمە ئەڵێین کە دلنیاین لەوەی بەهیــچ جۆرێك شانۆیی‌و شانۆگەری لەم ناوچەیەدا بە شێوەیەکی ڕێك‌و پێك‌و لەسەر یاسای شانۆگەری‌و بەوجۆرەی کە بێ‌سڵەمینەوە پێی بڵێین ( شانۆگەری ) نەبووەو نەبینراوە[1] ، ئەویش بێگومان بە هۆی ئەوڕژێمە دەرەبەگایەتی‌و دەستگاو دامەزراوانەی کە مافی چــەندکەسێکی حوکمڕانی ئەپاراســـت کەمەچەك‌و بازوویان لێ‌هەڵمالی‌بوو ، وەهەموو زادەیــەکی بیرو مێشکیان ئەتاساندو ئەیان ناشت ، ئەمە سەرەڕای شەڕو شـــۆڕو ناکۆکی‌و هێرشی دڕندانەی بێگانەو داگیرکردن‌و تالآن‌و زۆر شتی تری‌وا کە هیچ ماوەی نەئەدا شانۆگەری سەر هەڵبداو ببێتە پێشڕەوی خەڵکی ، هـــەروەها نەبوونی سەرچاوەیەکی وا کە ناڕاستی قسەکەمان بسەلمێنێ‌و بەڵگەیەکی بەهێز پیشان بدا بۆ بوونی ئەم هونەرە ••• ، گەشـتەکەی ( میستەر جیمس کلۆدیۆس ریچ ) بۆ کوردستان لەسالی ١٨٢٠دا ڕاستی ئەم قسەیەمان بۆ دەرئەخا کە بە ووردی‌لە کتێبەکەیا باسی کوردستان‌و سلێمانی ئەوســاو نەریت‌و بــاری کۆمەڵایەتی کوردمان بۆ ئەکاو هیچ باسێکی شانۆو شانۆگەری تیانیە •••

لەناوکوردەواری‌دا هەندێ نەریتی کۆمەڵایەتی وڕەوشتی خۆمــالی لەدرای سالەکانی (١٩١٠)وە دەستی‌پێ کرد بەتایبەتی لەناوچەی سلێمانی کە ئەتوانین بڵێین کەمێك بۆنی ئەوەی لێ‌ئەهات کە بناغەبن بۆ شـانۆگەری‌ی کوردی •

بەڵام ئەگەر بێتو سەرنجی ئەم نەریتانە بدەین‌و لەڕووی هونــەری‌یەوە هەڵیان سەنگێنین زۆرباش بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە لە گیانی (درامی)یــەوە دورن‌و دانانرێن بەو شانۆگەری‌یەی کە ( ئەرستو )باسی کردووەو ئــەڵێ :

---

(١) لەسەرەتای باســـەکەمانا ووتمان کە ئەو کارە هونەری‌یانە کەمێك بۆنی شانۆیی لێ‌هاتووە ، بەمانایەکی لاسایی .

« چوارچێوەکانی شانۆو دراما بڕیتین لە :
١ ــ زۆرانبازی بەینی دووهێز •
٢ ــ ئەکتەر •
٣ ــ گفتو گۆو قسەکردن •
٤ ــ بیرێکی فەلسەفی سەرەکی » •

وەکو ووتمان ئەم نەریتانە لای خۆمان بووەو لە زۆر کاتا بینراوەو ــ ئەتوانین ناوی هەندێکیان لێرەدا بڵێین ••• ( بووکە بەبارانە )و ئاهەنگی ( سەمەنی ) و ( درۆینە )و (ساوەرکوتان) و ( سەیرانەکانی بەهار)کەئەمەیان مەبەستمانەو حەز ئەکەم هەندێك لەسەری بدوێم ، بۆ ڕوونکردنەوەی سەردەمێکی مێژوویی گەلەکەمان لەلایەکەوە ، لە لایەکیترەوە چونکە زۆرکەس ئەم سەیرانانەو ئاهەنگەکانی بەسەرەتای شانۆی کوردی دائەنێن :

لەپێش سالەکانی (١٩٢٠)داــواباو بووە لە سلێمانی کە پیاوە ماقووڵەکانی شار لەبەهارا کۆ ئەبوونەوەو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ فەرمان ڕەوایی شاریان ئەگرتە دەستو هەموو فەرمانو حوکمێکیان ڕەوابوو دەست بەجێ ئەهێنرا بەدی[1] ، ئەوەبوو ــ وەکو کاك عومەری نەعمان ئەڵێ ــ لەسالی ١٩١٢دا لەمزگەوتی گەورە مەلایەك هەبوو پێیان ئەووت (مەلابچکۆل) زۆر زیرەكو لێهاتوو و دەنگ خۆشبوو ، لەو سالەدا ئەم مەلا بچکۆلەیان هێناو کردیان بەپاشاو ئاهەنگێکی گەورەیان لە مەیدانەکەی بازاڕە بچکۆلە ــ شوێنی قوتابخانەی کاتێکانی سەرەتایی کۆنــ پێكهێناو پێستی دوو بزنیان کردبووەبەر دووکەسترو لەلایەکی ترەوە دووکەسی تریشیان هێنابووو پێستی دووگایان کردبووە بەریان ، ئەم چوارەیان سواری کۆلی یەکتری کردبوو ، بۆ ماوەی دوو شەوو دوو ڕۆژ بەزەماوەندو هەلپەڕکێو دەهۆڵو زوڕنا لێدان بەدیار ئەم دوو بزنو دووگایەوە ڕایان بوارد ، پاشان ڕوویان کردە سەرچنارو خەلکی شار هەمووی بەدوایانەوەو بەپێ ڕۆیشتنو لەوێ کۆبوونەوەوو

(١) ماموستا ئەحمەد خواجە ئەڵێ : لەپێش ( ١٩٠٠) وە لەکاتی حوکمی بابانەکانەوە ئەم نەریتە لە کوردستانا باو بووە •

میری‌یان بەسەرۆکایــەتی مەلا بچکۆل دروست‌کرد ، نان‌و چێشت دروست ئەکراو جەندرمە خەڵکی گوناهباریان ئەخستە ناو ئاوی سەرچنارەوە ، کــە ئەوسا پێیان ئەووت ( بەحری سەرچنار ) ، دەوارو چاتۆڵێکی زۆر هەڵئەدراو پاشا حوکمی خۆی ئەکردو هەمیشە کۆڕی ئەنجومەنی گەرم بوو ، خەڵکیش بەیاری ئەو سەردەمەو گاڵتەو ڕابواردنەوە ئەو سێ ڕۆژەیان زۆر بەخۆشــی ئەبردە سەرو لە دواییدا هەر بە دەهۆڵ‌و زوڕناو هەڵپەڕکێوە گەڕانەوە نــاو شار ...

ئەتوانین بڵێین کە قەسابەکانیش هــەر لەمانــەوە فێری ئــەم جۆرم ئاهەنگانە بوون‌و لە ساڵەکانی بیستا سەیرانەکانی سەرچناریان دروست‌کرد ، لەپێشەوە بەهەموو شەقام‌و کۆڵانەکانی شارا بەدەهۆڵ‌و زوڕناو خۆگۆڕینەوە ئەسوڕانەوەو ( فەرەج کوردی )لەمەدا ئەکرا بەپاشا ، لەو کاتەدا ( ئەحمەد بەگی توفیق بەگ ) موتەسەریف بوو ، دەستوری دابوو بەم تاقمە کــەچی ئەکەن بیکەن تەنیا دوو شت نەبێ، بەرەڵاکردنی بەندەکانی میری،وخنکاندن‌و کوشتنی خەڵکی[1] ...

جا لەم ئاهەنگانەدا هەندێ ئاژەڵ ــ بەتایبەتی حوشترو گا ــدروســت ئەکران‌و سواریشی ئەبوون‌و جار بە جاریش زەلامەکانی ناوی ئەگۆڕان ئینجا هەموو دانیشتوانی شار ڕوویان ئەکردە سەر چنارو لەوێ چـــادرێکی زۆر هەڵئەدرا کە لەخێڵ‌و دێهاتەکانی دەورویشتی شار ئەسەندراو بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك‌و جوان ئەم خەڵکە هەموو ئەژیان‌و ئاهەنگ‌و یاری‌و هەڵپەڕکێ‌و جۆری ڕابواردنی ئەو کاتەیان پێك ئەهێنــا ... ، وەکو ووتمان ( فــەرەج کوردی ) کە پاشا بوو لە خێوەتێکی گەورەو ڕازاوەدا دانیشتبو بۆ ئەوەی پێکەنین لە دەمی بێتە دەرەوە یان کردەوەیەکی ناماقوول‌و سەرنج ڕاکێشەر بکات کە لایەقی پاشایەتی نەبێ ، پاشا سەرپەرشتی‌و حوکمی ئەکردو بەڕێزان ( مەلامحی‌الدین ماستاو )و (عەلی برزو )و ( عزیزی عارفی ئەمینە بچکۆل )و

(١) ئەڵێن گوایا ( فەرەج کوردی ) جل‌و بەرگی (موستەفا پاشای یاملکی)لەبەر ئەکرد .

( حاجی ئەحە کریس )و ( حاجی دەروێش )و زۆری تر وەزیر بوون ، بەڕێــز ( حەمە افندی صالحی ڕەشان ) سەر وەزیر بوو ، هـــەروەها ( ســـەعەی دەوڵەت ) کە بە ( عەمی ) بەناوبانگ بوو یاوەری پاشا بوو ، بەڵام مامۆستا ( حاجی مەلا ئەسعەدی مەحوی ) ئەڵی : زۆر جار ئەم ( عەمی )یە ئەکرا بـە پاشاوو لە کۆشکی گەورەی پاشایی‌دا دائەنیشت ..

جا ئەم میری‌یە هەقی ئەدایەوە بە خاوەنی‌و گوناهباری ئەکردو پارەی لێ‌ئەسەندن، یان بەهۆی جەندرمەکانی‌یەوە ــ بەتایبەتی حاجی عەلی جاسوس‌و بەکرە شەکۆل‌و فەرەجی عەبو وتێرە ، کە پێیان ئەووتن ( بەحری ) .

ئەیان خستنە ئاوەکەوە ، لەو ماوەی سەیرانەدا خواردنەوەی مـــەی قەدەغە بوو ، سەرپێچی کار لە ئاوەکەی سەرچنار بەتۆڵەی خۆی ئەگەیی ... هەتا ئەگێڕنەوە کە جارێکیان ( ٥٠٠ ) روپیەلە حاکمی سیاسی سلێمانی لــەو سەر دەمەدا ئەسەنن کە لەوانەیە میستەر چەیمەن یان گرین هاوس بوبێ ... مامۆستا ئەحمەد خواجە ڕاستی ئەم قسەیەی سەلماندو ووتی کــە ئەوحاکمە ( مێجەرسۆن )بوو .

شاعیری نیشتیمان‌پەروەر ( پیرەمێرد )کە شاعیری تایبەتی پاشابوو لــە کۆبوونەوەو ئاهەنگەکانی ئەم سەیرانانەدا ئەی چریکاندوو بەدەنگی زوڵاڵی ئەوەندەی‌تر خەڵکی ئەهێنایە جۆش‌و ئەی‌گوت :

لەشـــەوی بەزمی سەرچنارانی وردە بارانی ژێر دەوارانی
ووشـــکە سۆفی ئەخاتە گۆرانی[1]

لەم سەیرانانەدا بەو پارەیەی کە لە خەڵکیان ئەسەندو ئەو پارەیەی کــە خۆیان کۆیان ئەکردەوە نان‌و خواردنێکی زۆریان دروست ئەکرد بۆ ئــەم خەڵکە کە زیاتر ژنەکانی قەسابەکان لێیان ئەنا لە مەنجەڵی گەورە گــەورەی ڕیز کراودا بەسەر پەرشتی ( عەواش)و ( گولیلی عاسە )و ( شـــەوکەتی ژنی غەرەجی سمایل کۆیی )و زۆری‌تر ...

قەسابەکان لە یەکەم ئاهەنگیاندا تــەپڵێکی زۆر گەرەیان دروســت

(١) مامو‌ســتا شاکر فەتاح ئەڵێ : ئەم شیعرە پەیوەندی بەو باسەوە نی‌یە .

کردبوو کە دوو مووروویی گەورەی لە سەرەوە پێوە بوو ، لەخوارەوە دوو پەتی گوشیان پێوە بەستبوو کە ڕایان ئەکێشا مووروەکان لە تەپڵەکەیان ئەدا کەپێیان ئەووت (تەپڵی ئەفلاتون)، ئەووترێ کە کاتێك (شێخ مەحموود)چوو بەگژ ڕووسەکانا ــ لەچاری دووەما ــ ئەم تەپڵەی بەکار هێنا لەکاتی هێرش بردنیا ...

هەر لەم سەردەمەدا لە سلێمانی وا باو بووە کە لەکاتی ( شـــەوارە )دا هەندێ بینراوی بچووكو سەر پێیی لە چوارچێوەی ئـەوماڵەدا پێشکەش بکەن ، و خۆیان گۆڕیوەو تەمسیلی ئاشەوانو پاشاو ئاژەڵیان کردووەو هەتا بەیانی بەگۆرانیو یاریو تەمسیلەوە ڕایان بواردەووە .

لەم بارەیەوە مامۆستا (حاجی مەلا ئەسعەدی مەحوی) ئەڵێ : کەکۆمەڵی خانەقا ( خانەقای مەحوی ) هەمان ئاهەنگو ســـەیرانیان کردووە چ لەناو خانەقادا بەبۆنەی دەرچوونی مەلایانەوە کە دوانزە عیلمیـــان تەواو ئەکردو ئیجازەی مەلایەتییان ئەدرایە ، چ لە دەرەوەی شارــبە تایبەتی لە(قرگە)یان لە ( دارەکەی سۆفی نەبی )لە کانیجنە لای تاسلوجە[1]و لەگەڵ ئەمانا خەڵکی گەڕەکی چوارباخو ســـەرشەقامو دەرگەزێن ئەچوون ، خوالێخۆش بوو ڕەشۆڵو مەحموود حەسەنو ئەحمەد حەسەن لە ناویاندابوونو سەرپەرشتی ئاهەنگو نواندنی هەڵپەرکی کانیان ئەکرد ، هەروا لەئاهەنگەکانی مزگەوتـا زۆر پیاو ماقووڵو کاربەدەستانی گەورەی شار ئەهاتن ، هەتا جارێکیـــان ( موستەفا پاشای یامولکی )هات بۆ خانەقاو ( عیززەت مەدفـەعی ) کـەبـە ( عیززەتی فاتە ) بەناوبانگ بوو لە گەڵیا هات ، لەو ئاهـەنگەدا بانگێشتنی هەموو دەســتەو دایـەرەی خانەقای کردو داوەتێکی باشـی بۆ کردن ...، مەلا ئەسعەد ئەڵێ کە ئیشو کاری هونەری لە ئاهەنگەکانی مزگەوتەکانا، خوا لێخوش بوو ( ڕەفیق چالاك ) سەرپەرشتی ئەکردوو ڕێکی ئەخست .

وەکو ئەڵێن کـە ئەم نەریتـە لە زۆر لای تری ناوچەکەدا باو بووە ،

---

(1) مامۆستا ئەحمەد خواجە ئەڵێ : زور جـــار خەڵـــکی شار ئەچوون بۆ ( دارەکەی شیخ هەباس )لای قەرەتۆغان بۆسەیران .

بەتایبەتی لە هەولێرو کۆیەو کەرکوکو هەڵەبجەو قەلادزێو زۆر شوێنی تر ، کە هەریەکە لە کاتی خۆیا باسی ئەکەین •

لێرەدا مامۆستا مەحموود کزەڵ بۆی سەلماندین کە هەتا دوای ساڵەکانی چلیش ئەم جۆرە ئاهەنگانە باو بووە لە ناوچەی خۆشناوەتی ،و خۆی بەشداری هەندێکی کردووە لە دێی ( بانی سان ) •.

مامۆستا کزەڵ ئەڵێ : کە شانۆو شانۆگەری ـ بەرای ئەو ـ لە مزگەوت و شوێنە ئایینی‌یەکانا هاتە کایەوەو پیاوانی ئایینی بناغەیان دانا لە کوردستانا ، هەروەکو سەرەتای شانۆی جیهانی لە جەژنو بۆنە ئایینی‌یەکانی یۆنانەوە دەستی پێ‌کرد ، هەروا ئەڵێ : کە فەقێکانی پێشی ئەو سەردەمە ـ واتە پێشی ١٩١٠ ـ هەندێ بینراوی تەمسیلی یان زۆر بەساکاری لە ئاهەنگو کاتی رابواردی خۆیان کردووە •

هەروەها ئەڵێ : بینراوە تەمسیلی‌یەکان بە گۆرانی‌و ئاوازەوە بە شێوەی (ئۆپەرێت) پیشانی خەڵکی ئەدرا ورەخنە لە کردارو نەریتە نامـاقووڵو نابەجێکانی ناو کۆمەڵ ئەگیرا لە ئاهەنگەکانی مەلاو فەقێکانا ـ کە تاکە تاقمی رۆشنبیری ئەو کاتە بوون ـ، خەڵکی ئەو ناوچەیەیش ـ تاقمێک ـ باری سیاسی‌ناوچەکەیان بۆ ماوەی سێ‌رۆژ ئەگرتە دەستو خەڵکی زۆر لێ‌کراو مافی بۆ ئەسەندرایەوە •

بێجگە لە ناوچەی خۆشناوەتی ـ مامۆستا کزەڵ ئەڵێ ـ ئەم پەندو باوە لەناو چەکانی تری ئەو ناوە باو بـووە،وەکو:دەشتی دزەیی‌و هەکاری‌و رەواندزو باڵەکایەتی‌و شوکاکو زۆر شوێنی‌تر •••

لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە لەلایەکەوە بیسەلمێنین کە گەلی کوردمـان بەهۆی رازاوەیی خاکەکەی‌و سروشتە جوانەکەی‌و هەستی ناسکیەوە هەر لەزووەوە حەزی لە ئاهەنگو رابواردنو هونەر کردووە، لەلایەکی تریشەوە بلێین کە لەو ئاهەنگانەدا هەندێ بینراوی تەمسیلی بچـووکو سـەرپێیی کراوە کە هەندێ لە رۆشنبیران ئەڵێن لەوانەیە بناغەی شانۆگەری کوردیمان بێ ••• بەڵام ئێمە ئەڵێین کە ئەمانە بەسەرەتای شانۆگەری بەمانای ووشە نازانین‌و بەڵکو زیاتر نەریتو رەوشتی کۆمەڵایەتی ئەوسەردەمە بوون کە لە

ناو زۆربەی میللەتە تازە پێگەیشتــووەکانو سەرەتــایی‌یەکانــا ئەبینرێ وهەریەکە لەلای خۆیە جۆرە (فــولکلور)ێکی تایبــەتی هــەیە بــۆ کات بەسەربردنو پیشان دانی شێوەی ژیانو یەکبوونی خەلکی ئەو سەردەمە، ئەمانەشی وەکو ئێمە هەمیشە شوێنی سەربەرزی و شانازی‌یان ، بوون ..

بەم جۆرە لەبەردەمی ئەم هونەرەدا لــە مێژووی گەلەکەمــانا دۆش‌دا ئەمێنین هەتــا ســاڵەکانی دوای بیست کە دوای شــەری جیهانی یەکەم[1] کە نەخشەی زۆربەی لاکانی جیهان گۆڕانی بەسەرداهاتو سنووری نێوانی بیری مرۆڤ لەهەمولایەکی جیهانا شکاو چەندەها بیرو بــاوەڕو ڕێبــازی تازە جێگای خۆی‌کردەوە لە دژی ئیمپریالیزمو بەرپا بوونی شۆرشی رزگاری و ئازادی خوازی لەنــاو میللەتانا ، ئەمانە هەمووی ئاگاداری‌یەك بووکــە شانۆی کوردی بێتە کایەوەو بەشێوەیەکی ساکار چەند ئیشێکی هونــەری سەری هەڵدا، لێرەدا مامۆستا ( حەمەکەریم هەورامی ) ئەڵێ:لە (١٩٢٢)داــ چیرۆکی ( قەڕالیچەــالامبراطور )لە سلێمانی پێشکەش کراوە، هەروەها لە هەمان ساڵا شانۆگەری یەکەی شاعیری مەزن (شێخ سەلام)ــجوولەکەی کۆل گێڕ ــ لە شوێنی گەراجی ئەسحابە ســپی لە ســلێمانی پێشکەش کراوە ، بەڵام هیچ سەرچاوەیەکی تری وام دەست نەکەوت کە ئەمەبسەلمێنێ ، تەنانەت مامۆستا (فؤاد رشید بکر)ــکە ئەتوانم بلێم باشترین سەرچاوەی شانۆی کوردی‌یەــهەروەها (یەحیا ئەفەندی وێنەگر)دانیــان بەم قــەیەدا نــەناو پشت‌گیری‌یان نەکرد ، تەنیا بەرێز(ناهیدە شیخ سەلام)نەبێ کە ئەڵێ ئەم قسەیە ڕاستەو بەڵگەشی بۆ ئەمە نیە ، هەروەهــا چــاو خشــاندنێك بە یادداشتەکەی مامۆستا رەفیق‌حیلمی‌دا ئەی ســەلمێنێ کە لەو کاتەدا هیچ بزووتنەوەیەکی هونەری شانۆگەری لە کوردستانانەبوە[1].

بەم جۆرە شانۆی کوردی مەکەچ وبێ‌خاوەن بە پەرۆشەوە چاوەرێی ئەوەبوو دەست بدەنە پەلی‌و لە تاریکی‌و قووڵایی نەبوون رزگاری بکەنو بیکەنە پێشرەوی گەلی کوردمانو شوێنی پیرۆزی خۆی بدەنێ ...

---

(١) لەســاڵی ١٩١٤ دا دەستی پێ‌کردو لەساڵی ١٩١٨ داکۆتایی هــات ، وە لەساڵی ١٩١٩ دا عیراق‌گیراو لە ١٩٢٠دا ئینگلیز هاتنە کوردستان .

هەرچەندە ــ وەکو ووتمان ــ ئێمە دان بەوەدا ئەنێین کە لە بیستەوە ــ بگرە لــەوەپێشیش ــ بزووتنــەوەیەکی هونەری ســاکارو ســەر پێ‌یی لە قوتابخانەکان‌و مزگەوتەکانا دەستی پێ‌کردبوو ، لە ئاهەنگەکانا بینراوی تەمسیلی بچووك‌و ساکار پیشانی خەڵکی ئەدران ، بەڵام لە بەر ئەوەی کە ئەو تام‌و چێژەی نەبوو کە پێویست بوو لە شانوگەری یا بێ ، تەمەنی کەم بوو خێرا لە بیر ئەچووەوەو بە هۆی ئاڵۆزاوی ژیانی ئەوساو باری نالەباری خەڵکی‌یەوە وون ئەبوو ناوی نەئەما ..

کە ئەشڵێم (خەڵکی) زیاتر مەبەستم ئــەو چەنــد کەســەیە خــۆیان بەڕۆشنبیر ئەزانی‌و بۆ بینینی ئەو ئاهەنگانە ئەچــوون ، ئەگینــا زۆربەی زۆری خەڵــکی تر هەر نەیان ئەدی ولێ‌ی بێ بەشی بوون ..

کەواتە لە مێژووی شانۆی کوردی‌دا بە بیابانێکی وشك‌و بەریندا ملی ڕێ ئەگرین‌و بێ‌هوودە ئەگەڕێین بەشوێنیا ، هەتا لە پڕێکا تروسکەی ئاواتمان لە(١٩٢٤ــ١٩٢٥)داــدەر ئەکەوێ ، لەو کاتەدا کە قوتابی‌یە کوردەکان لە (١٩٢٢) بەدواوە لە بەغدا لە قوتابخانەی مامۆستایان ئەیان خوێنــدو جار بە جارێك سەری شانۆو ڕابواردنگەکانیان ئەداو هەنــدێ شــانۆگەری‌و بزووتنەوەی شــانۆیی‌و ئەدەبی‌یان ئــەدی کە بە عەرەبی‌و تورکی پێشکەش ئەکران ...مامۆستامان (فؤادئەفەندی) لەم بارەیەوە ئەڵێ:

لە بەغدا شانۆگەری‌یەکمان دی بە نــاوی (لولا المحامی) ــ واتــە ئەگەر پارێزەر نەبوایە ــ ، ئێمە هــاتین ئــەم چیرۆکەمان (تکرید) کــردو ناومان نا ( عیلم‌و جەهل ) ساڵی (١٩٢٦) دا ، لە سلێمانی‌و لە سەر سەکۆکەی ماڵی (بەهیەخانی ژنی شیخ مەحموود )و لە بەر ڕووناکی چرا پێشکەشــمان کرد ، پاش ئەوەی پەردەو دیکۆرو پێویستی تری شانۆمان بۆ جێ بە جێ کردو حەوشەکەمان بە جوانی ڕازاندەوە ، کە ئەوسا ئەو خانووە قوتابخانە بوو پێیان ئەووت ( مەکتەبی ئەوەل ) .. لە هەمان ساڵا چیرۆکی ( نــیرۆن ) یشمان لە تیپی (جورج ابیض)ی میسری وەرگــرت کە لە ســەر شانۆی

(١) مامۆستا ئەحمەد خواجەش لەم بارەیەوە ئەڵێ کە لەپیش ١٩٢٥دا هیــچ بزووتنەوەیەکی شانۆگەری نەبووە .

(سەنترال)لە بەغدا پیشانیان ئەدا دوای گۆڕینی بۆ کوردی لە سالی(١٩٢٦)دا، لە لایــەن قوتابخــانەی ( زانستی )یەوە پێشکەشی کرا ، ( کریم زانستی )و (فؤاد ئەفەندی)و (یەحیا ئەفەندی)و هەندێکی تر بەشداری‌یان تیا کرد[1]..
لەوانەی لەم سەردەمەدا چاکی ئیش‌کردنی هونەری‌و بازووی کۆلنەدانیــان لێ هەلمالی بوو بناغەی شانۆگەری کوردی‌یان دامەزراند مامۆستــایــان (واحد ئەفەندی‌و مستەفا صائب‌و فؤاد ئەفەندی‌و رشید کریم‌و تایەر بەگی یەحیا بەگ‌و رەمزی قەزازو شوکور سید حەکیم...)و زۆری تر بوون لە رۆشنبیران‌و دلسۆزان کە گولی لاوی‌یان کردە دەسك‌و پێشکەشی دیوەخانی هونەری کوردی‌یان کرد ، بەهۆی رێك خستنی ئاهەنگ‌و پێشکەش کردنی چیرۆکی تەمسیلی‌یەوە پارەیان کۆ ئەکردەوە بۆ خزمەتی قوتابی‌یە هەژارەکانی شار کە لە (مەکتەبی ئەوەل)و (مەکتەبی دووەم) ــکە ئەوسا پێیان ئەووت مەکتەبی پەڕۆ ــئەیان خوێندو خەریکی هەل کردنی چرای زانستی بوون، یاخود بەو پارەیە کەل‌و پەلی شــانۆیان ئەکڕی ، یان لە ئاهەنگ‌و بەزم‌و سەیرانی ئەوسادا سەرفیان ئەکرد ..
لێرەدا نوکتە شیرینەکەی مامۆستا فؤادم بیر کەوتەوە کە بۆی گێڕامەوە ووتی : لەکاتی نواندنی چیرۆکی (علیم‌و جەهل*)دا، لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا حەوزێکی ئاو هەبوو ، ئێمەش بەخێرهاتنی میوانەکانمان ئەکرد پێش ئەوەی دەست بکەین بە پێشکەش کــردنی تەمسـیلەکە . کــە هەمووی پیــاو ماقوول‌و گەورە پیاوانی شار بوون ...ئەوەندەمان زانی شلپە هــات ،

---

(١) خوا لێ خۆش بوو رەفیق چالاك ئەلێ : ئەم چیرۆکە لە ســالی ١٩٣٣ لــە کۆیە پێشکەش کراو لە سالی ١٩٢٤دا ، لە رەواندز پیشان درا .
مامۆستا شاکر فتاح ئەلێ : لە گەل ئەم شانۆکەری‌یەدا هەندێ بینــراوی بچووکی تریش پیشان درا .
بەلام رۆژنامەی ( ژیان ) ژمارە ٧٦ سالی (٢) ئەلێ : ئەم چیرۆکە بۆ ماوەی دوو شەو ( ٢٧ ــ ٢٨ / تەمموز / ١٩٢٧ ) پێشکەش کرا .

(*) لەوانەیە ئەم چیرۆکە هەر ئەو ( نەتیجەی سەفاهەت )ە بێ کە رۆژنامەی ژیان ژمارە (٢) سالی (١) باس کردووە .

کابرایەکی جوولەکەی عەبا بەشـان کەوتە نـاو حەوزەکەوە ، بوو بە بەزمو پێکەنینو هەرا .. تومەس کابرا ئەوەندە بەم لاو ئەو لای خۆیا ڕوانی بوو سەیری ڕازاندنەوەی حەوشەکەی کرد بوو ئاگـای لە خۆی نەما بووو ئەوەندەی زانی بو لە حەوزەکەدا شلپەی دێ ... ئێ ، ئێمـەش چیرۆکمان پێشکەش کردوو لە دواییدا ویستمان ڕای خەلـکی وەرگرین بەرامبەر بـە بەرهەمەکەمان ، یەکێك ووتی : « باوکم بە خوا تەمسیلەکەتان خۆش بوو ، بەتایبەتی لەو کاتەدا کە جوولەکەکە کەوتە ناو ئاوەکەوە ، ئەوە لە هەمووی خۆشتر بوو !! ..».

ئەگەر بێتو کەمێك لەم نوکتەیە وورد بینەوە ، بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە خەلکی لەو سەردەمەدا ئاشنانەبوون بە شانۆ ،بەلکو لە چوونیشیان بۆ ئەم ئاهەنگو تەمسیلانە زیاتر بۆ چاو لێکەریو دانیشتن بووە لە ناو پیاو ماقوولانا ...

لێرەوە ئێمە ئەتوانین بێ سلەمینەوە بلێین کە شـانۆی کوردی بە شێوەیەکی نوێو ڕێكو پێك بەم دوو چیرۆکە شانۆیییە لە دایـك ئەبێت وچاو هەلئەهێنێ، چونکە دووایئەم مێژووە زنجیرەیەك شانۆگەری دێتە کایەوەو پیشان ئەدرێ ، بەتایبـەتی لە قوتابخانەکاندا کران بۆ مەبەستێکی وەختەکیو بەس ، ئەو شانۆگەرییانە زیاتر لە چیرۆکەکانی بێگانەوە وەر ئەگێڕرانە سەر زمانی کوردی[1] .

لە سالی ١٩٢٦ دا (جەمعیەی زانستی کوردان) دامەزراو هەولێکی بێ شوماری دا بۆ پەرەسەندنو پێش خستنی گەلی کوردمان لە هـەموو ڕوویەکەوە، ئەوە بو (مەکتەبی زانستی) کە ڕوویەکی ڕووناکی ئەم(جەمعیەیە) بوو ئالای ڕۆشنبیری هەلـکردو بە چرای زانینو پەروەردە پێش کۆمـەلی کوردستان کەوتو ڕۆشن کردنەوەی مێشكو بیری خەلکی گرتە ئەستۆوو لە سالی ١٩٢٧ــ١٩٢٨دا شانۆگـەری (یۆلیۆس قەیسەر)ی لە سلیمـانی

(١) ماموستا ئەحمەد خواجە ئەلێ : لە سالی ١٩٢٥ دا ماموستایان عـەلی ئاگاو نیهال جەلال بەشداری تەمسیلیان کردووە .

پێشکەش کرد کە مامۆستایان ( رەمزی قەزاز ) وە ( شـــوکور سەید حەکیم ــ شارکە ڕەش )و ( رشید کریم )و هەندێکی تر دەوریان تیـا بینیوە ، ولـە هەمان سالاّ ــ یان بە شێوەیەکی وورد تر بیلێین لە سالی (١٩٢٨ــ١٩٢٩)داــ ئەم مەکتەبە چیرۆکی شانۆگەری (شۆرشی فەرەنسە)ی پیشاندا کە بەڕێزان (فایەق بێ‌کەسی) (ــکریم زانستی)(أ٠ب٠ هــەوری) (خەسرەوی حــاجی ئاغا ) ••• زۆر هونەرمەندی تری شارەکە بەشداری‌یان تیا کردووە[١] .

مامۆستا فؤاد رەشید ئەلێ کە قوتابی‌یە کوردەکانیش لە بەغدا لە سالی ١٩٣٠ ــ١٩٣١ دا لە سەر شانۆی قوتابخانەی مامۆستایان چیرۆکی تەمسیلی ( ژن هینانی کوردەواری )یان بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك پێشکەش کردوە .• ئینجا هەر هەمان کۆمەل (کۆمەلی قوتابی‌یانی مەکتەبی زانستی)لە ســالی (١٩٣٢)دا شانۆگەری ( ســەربازی ئازا )یــان پێشــکەش کرد لــە شوێنی چایخانەکەی ئێستای حەمەڕەق ••کە ئەمە وێنەکەیەتی.



« ســەربازی ئــازا »

---

(١) ماموستا شاکر فەتاح ئەلێ : لە گەل کردنەوەی مەکتەبی زانستی‌دا لــە سالی (١٩٢٦)داــئەم شانۆگەری‌یە پێشکەش کراو ئاهەنگی موســـیقاو گورانیشی لە گەل بوو،لەو کاتەدا مەکتەبی زانستی لە صابونکەران بوو ، ئەمیش ــ ماموستا شاکر ــ قوتابی بوو .

بەشدارانی شانۆگەری ( سەربازی ئازا ) : (١٩٢٣)دا ـ ڕیزی پێشەوە (لە ڕاستەوە بۆ چەپ):

١ ـ عبدالواحد نوری شاعیر
٢ ـ شێخ نوری شێخ مارف •

دانیشتووەکانی ریزی دووەم :

١ ـ جەلال ئەفەندی
٢ ـ جەمال مەجید (••••)[1]
٣ ـ ئەحمەد حەسەن•
٤ ـ فەهمی توفیق قەفتان•
٥ ـ شاکر حەکیم (شاکیرە ڕەش)
٦ ـ رەشید کەریم
٧ ـ ڕەمزی قەزاز
٨ ـ فائق مەحموودە فەندی[2]•
٩ ـ تاهیر بەگی یەحیا بەگ•

ڕیزی پشتەوە :

١ ـ موحەمەد توفیق قەفتان•
٢ ـ جەمال مەجید (••••)[1] •
٣ ـ یەعقوب ئەفەندی (تلکێفی بوو)
٤ ـ فەوزی ئەفەندی
٥ ـ حامید فەرەج
٦ ـ موحەمەد ئەدیب ئەفەندی (لە هەولێرە)

ئینجا دووای ئەمانە لە ساڵی ١٩٣٥دا قوتابخانەی زانستی بە سەرپەرشتی مامۆستایان فؤاد ئەفەندی‌و کریم زانستی ، چیرۆکی تەمسیلی (صلاح‌الدین)

---

(٢) هەندێك ئەڵێن ئەمە ناوی (سەید ئەحمەد سەید وەلی)یە و خەڵکی کۆیەیە.

یـان پێشکەش کرد کە مامۆستا کریم خۆی دەوری سـەلاحەدینی بینیوەو مامۆستا فؤاد ئەفەندیو حاجی باقی (بەنگینە)و زۆری تر دەوریان تیـا دیوە ، لەهەمان ساڵا لە کۆیە دووبارە کرایەوە ، لە سـالی (١٩٣٨)یشا لـە هەولێر بۆ یەکەم جار پیشان دراه

چیرۆکی شانۆگەری (دلداریو پەیمان پەروەری) لە نووسینی مامۆستا شیخ ئەبو بەکر هەوری بە یەکەم چیرۆکی شانۆگەری خۆمالیدا ئەنرێ کە لە سالی (١٩٣٣)دا ، بۆ یەکەم جار لە سلێمانی پیشان دراو مامۆستا هەوری دەوری (شیرۆ)ی ئەبینی محمود احمد دەوری (نازەنین)، لە گەل ئەمانیشا حاجی عەلی ماستاو و وەستا کەریم خەیاتو حاجی عەلی جـاسوس هاو بەشیيان کرد ، ئەڵێن گوایا بناغەی قوتابخانەی گۆڕژەی کوڕان بە پارەی ئەم شانۆگەرییە دامەزراوە ٠

ئەم شـانۆگەرییە لە زۆر شوێنی تر پیشان دراوە ، وەکو هەڵەبجەو قەلآدزێو چوارتاو ٠٠٠بە کورتی ئەم چیرۆکە ـوەکو مامۆستا هەوری خۆی ئەلیـتا ئیستا هەشت جار تەمسیل کراوە ، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە حاجی علی جاسوس هەر لێرەوە ناوی (جاسوس)ی بەسەرا سەپێنراوە ٠٠

دێینەوە سەر باسی چرای زانستیو ڕۆشنبیریی گەلی کورد (مەکتەبی زانستی ) کە لە سالی (١٩٣٥)داـ شانۆگەری ( شیرینو خەسرەو )ی پیشانی خەلکی سلێمانیدا کە بەڕێزان خەسرەوی حاجی ئاغاو فەهمی توفیق ئەفەندی ئەفتان و زۆری تر بەشدارییان تیا کرد ٠٠

بەڕێز کاك ( مەجید فتاح حاجی سعید ) ئەڵێ : ئەم تەمسیلە منیشی تیـا بووم ، لە پێش ئەوەشدا ئێمەی قوتابییانی مەکتەبی زانستی هەندێ تەمسیلی ترمان پێشکەش کرد کە ئەمانەن :

لە سالی (١٩٣٤)داـبینراوێکی ئینگلیزیمان گۆڕی بۆ سەر زمانی کوردیو هەر بە ناوی (ئای٠ دی٠ پولۆ)وە پێشکەشمان کرد ، لە سالی (١٩٣٥)دا ، مەکتەب چیرۆکە نەمرەکەی ئەحمەدی خانی ( مەمو زین )ی پێشکەش کرد ، و لە سالی (١٩٣٦)دا،چیرۆکی شانۆگەری (مەحموود ئاغای شێوەکەل)مان لە شوێنی ئوتێلەکەی ئیستای حاجی برایم ئاغا ( ئوتێلی گەل ) پێشکەش کردکە

خوا لێ خۆشبو حاجی باقی ( بەنگینە )و عەلی سەعیدی قالە بانەیی‌و عومەری سەعیدی قالە بانەیی‌و جلال قادرو نوری شێخ جلال بە شداری‌یان تیا کرد ، لە ســالی (١٩٣٧)دا ، شانۆگەری ( شەریف هەمەوەند ) مان پیشاندا کــە قوتابی‌یەکانی مەکتەب دەورەکانیان زۆر بە جوانی ئەبینی‌و سەرنجی خەلکیان ڕائەکێشا ..

هەر وەها لەم سالانەدا ( ١٩٣٧ ــ ١٩٣٨ ) چیرۆکی شانۆگەری (ئافاتی تاعوون لە ناو حەیواناتا ) لە نووسینی ( شێخ سەلام )ی شاعیر پێشکەش کرا لە لایەن هەندی لە قوتابی‌یانی قوتابخانەی ( فەیسەلی‌یە )ی کۆن لە شــوێنی پارێزگەی ئێستەدا کە ئەو سایانەی سەربازی بوو ، لــە ژێر چـــاو دێری مامۆستا ( فؤاد رشید ) ، کاك ( توفیق حەسەن دەولەت ) بەشــداری تیـــا کردووە .

شەڕی نالەباری گەورەی جیهانی دووەم لە چلەکانا دەستی پێ‌کرد ... بە شێوەیەکی ڕاست‌تر ڕۆژی (٢) دووی ( تشرینی یەکەم ) ســالی ١٩٣٩ ، کە خوێن ڕێژە نازی‌یەکان فوویان کرد بەکەڕەنای شەڕو هێرشێکی درندانەو بێ بەزەیی‌یانەیان کردە سەر ( پۆلەندە )و لە ماوی (١٨) رۆژدا ، دوای تێــر خواردنەوەی هەموو خاکی پۆلەندە لە خوێنی ڕۆلەکانی ، گیرا .. شەڕێکی درندانەی ناهەموار پەرەی سەندو هەزارەها ، بەلکو ملیۆنەها ڕۆلەی گەلانی کردە قوربانی کلپەی ئاگرو کۆمەلانی هەموو جیهانی خســتە نـــاو دەردو ئەندێشەی لە ناو چوون‌و بێ دەرەتانی‌و ئاوارەیی‌یەوە هــەموو بەرهەمێکی بیرو مێشك سەرەولێژ بووەوەو گولۆلەی زانستی و هونــەر پچــڕ پچــڕو ئالۆسکاوی تێ‌کەوت ، بێگومان ئەم دووکەلە ڕەشە خنکێنەرە هەمو عیراق‌و بەتایبەتی کوردستانی گرتبووەوەو بزووتنەوەی هونەری ڕووی کردە کزی‌و لە ناو چوون ... هەتا سالی ١٩٤٥ کە شەڕ کۆتایی هات‌و مرۆڤی سەرزەمین هەناسەی پاکی هەلمژی،هونەری شانۆی کوردیشمان کەوتەوە خۆی‌و سەری لە خەوی ناخۆش‌و ئالۆزاوی هەلبڕی‌و کۆڕی هونەر لە دڕك‌و دالی شــەر پاك کرایەوە ..

وە نەبێ ئەم شەڕە توانیبێتی بیرو باوەڕی مرۆڤایەتی بمرێنی‌و لــە ناوی

بەرێ ، بەڵکو بەپێچەوانەی خواستی دوژمنانی گەلان بووە هۆی چاوکردنەوەو وریا بوونەوەی لاوە دلسۆزە خوێن گەرمەکان کە بە مێشك و بازوو لە هەموو لایەکی جیهانا بەرەنگاری ئارەزووی چەپەڵی خوێن مژان بوون و گەلی کوردیش سەرەڕای ناهومێدیو سەر گەردانی خۆی بە پێی توانا ــ بە هەر ناوێکەوە بوو بێ ــ دەستی یارمەتی بۆ ئەم ڕاپەڕینە پیرۆزە درێژکردو هونەری شانۆیی تەرخان کرد بۆ ئەوەی مژدەی ئازادیو رزگاری بدا بە گەلان .. ئەوە بو ــ وەکو ووتمان ــ لە سالی (١٩٤٥)دا ، ڕۆژی سەربەستی هەڵهات و شەڕ بە لە ناو چوونی تاوانبارە دڕندەکان دوایی هات ، شانۆی کوردیش کەوتەوە خۆیو لە سالی(١٩٤٤)دا،شانۆگەری ـیان با بلێین مەلحەمەی ــ ( مەم و زین )ی شاعیری نەمر (ئەحمەدی خانی) کرا بە سکربتی تەمسیلیەکی ڕێك و پێك و زۆر لە جاری پێشوو شەنگ تر پیشانی خەڵکی سلێمانی درا ... ئەم چیرۆکە هەرگیز نەمرە مامۆستا ( ئیسماعیل حەقی شاوەیس ) بە ( ئەلیاذە )ی کوردی دا ئەنێ، و (ئەلێ ) کە دادگای سەربەستی لە ئەستەمبوڵ ( مەحکەمەی ئیستیقلال ) لە کاتی مەحکەمە کردنی شێخ سەعیدی پیران و هاوڕێکانیا ئەم چیرۆکەی گوناهبار کرد بەوەی کە گەورەترین هان دەر بووە بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش ، ئەم چیرۆکە لە سالی (١٩٢٠)دا ــ بۆ یەکەم جار لە ئەستەمبوڵ چاپ کراو لە کاتی لە سێ دارەدانی شێخ سەعیدو هاوڕێکانیا هەر چی دەست نووس و چاپ کراوی (مەم و زین ) هەبوو هەمووی لە مەیدانی سەرادا سووتێنرا !! لە دواییدا لە ( حەلەب ) چاپ کرایەوەو بۆ زۆر زمانی جیهانی تر گۆڕرا ، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە هەر لەم چیرۆکەوە حاجی باقی ناوی ( بەنگینە )ی لێنرا ...

لە سالی (١٩٤٦)دا ــ کۆمەڵێك لە ڕۆڵە دلسۆزەکانی گەلەکەمان و بۆ باربووکردنی لێقەوماوانی بوومە لەرزەی پێنجوین دوو شانۆگەرییان لە سلێمانی پێشکەش کرد ، یەکەمیان ( لە ڕێی نیشتمانا )و ئەکتەرەکانی : کامەران و شێخ رەزاو قادر دیلان و توفیق حسن دەولەت و رەفیق چالاك و حسن توفیق ، هەر وەها کاك روشدی ئەحمەد سەعیدو ئەحمەدی حاجی

صالحی قاسمو فایەق چالاکو ئەحمەد هوشیاری جوانەمەرگو هەندێکی تر بوون •

شانۆگەری دووەم ئۆپەرێتی ( گوڵی خوێناوی ) بوو لە نووسینی مامۆستا (گۆران) ، کە کاک حمە صالح دیلانو مەحموود محمد لەیلیو عبداللە رەشید ( سالار ) بەشداری‌یان تیا کردووە •

مامۆستا ( کامەران موکری ) لەم بارەیەوە ئەڵێ : بەراستی سێ شانۆگەریمان پێشکەش کرد ، سێیەمیشیان ناوی ( دوکتوری دێم ) بوە لە نوسینی ( حەمە بۆر )و کاتێکیش هەر هەمان کۆمەڵ ئاهەنگەکەمان بردە هەولێر بوو بە چوار شانۆگەری کە چوارەمیان ( قژکالی لێو ئاڵ ) بوو لێرەدا ( رەفیق چالاک ) لە یادداشتەکەیا لە رۆژنامەی ( برایەتی )دا ـ ئەم قسەیە ئەسەلمێنێ •••

شاعیری بەرێز مامۆستا کامەران دیسانەوە ئەڵێ کە لە هەمان ساڵا ( ١٩٤٥ـ١٩٤٦ )کەشافەی هەموو شارەکانی عیراق ـ سلێمانیش ـ لە پێنجوین یەکیان گرتبوو ، ئێمە شانۆگەری ( ئاشتی )مان بە عەرەبی پێشکەش کردن کە مامۆستا ( نوری ئەمین بەگ ) نووسیبووی و بەرێزان سەعید شەفیق و کامەران موکری‌و قادر دیلانو زۆری تر دەوریان تیا ئەبینی(*) •••

(مەنوچەر) یان (کەرەلۆتی مەنوچەر) بە چیرۆک لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا بلاو کرایەوە ، کاک رەووف یەحیاو هەندێکی تر هێنایانو لە قالبێکی دراماتیکی زۆر جواندا دایان رشتو ناویان نا ( تێکۆشانی رەنجبەران )و لە سلێمانی لە سالی (١٩٤٨)دا پێشکەش کرا، بەلام جەندە رمەکانی میری‌ی ئەو سەردەمە کە قۆلی رقو قینیان لەگەل هەلمالی بوو ، پاش ئەوەی (ئەحکامی عورفی) دانرا،دوای (٩)ـ نۆ رۆژ پیشان دان هەلیان کوتایە سەر ئەندامەکانی

---

(*) زانیمان کە ماموستا ( رەمزی قەزاز ) روژی ١٠ـ١٠ـ١٩٤٤ داوای دروست کردنی تیپێکی تەمسیلی لە میری کردوومو یاساو پروگرامی پێشکەش کردووە ، کە ئیستا لە ( مەلبەندی وەسائقی شانۆ ـ المرکز الوثائقی للمسرح ) لە بەغدا هەیە .. بەلام داخەکەم نازانین ئەنجامو بەرهەمەکانی چی بووە ..

ئەم شانۆگەری‌یەو لەگەڵ هەزارەها ڕۆڵەی تری ئەم گەلەدا لە بەندیخانە توند کران‌و لە دواهەمین ڕۆژا نەیان هێشت شانۆگەری‌یەکە تەواو بکـەن ...
مامۆستا محمود توفیق لە بەڕیوەبەرێتی پەروەردەو رەفیق چالاك‌و کاك نوری وەشتی ئەم قسەیەمان ئەسەلمێنن ... ئەکتەرەکانی ئەم شـانۆگەری‌یە برێتی بوون لە : دارا توفیق ( کە دەوری ئافرەتی ئەبینی )و علی فتـاح و رەووف یەحیاو قادر حاجی سەعیدو عبداللە سالارو جمال عزیز و قادر دیلان ...

هەر لەم سالە دا (١٩٤٨)و هەر لە سلێمانی شانۆگەری (لەیل‌و مەجنون) پیشان دراو ئەکتەرەکانی برێتی بوون لە : علی فتاح‌و فەریدو فؤادی ئەمین ئەفەندی‌و عەلی فەرەجی قرجول .

لێرە دا مامۆستا ( عبدالقادر بابان ) لەم بارەیەوە باسی چەمچەمالمان بۆ ئەکا و ئەڵێ :

لە سالی (١٩٢٠) بە دوواوە یاری (کلاوێن)و (شەوارە)و هەندی یاری تر ئەکرا بە دەستووری یاری ( سینی‌و زەرف ) کە لە کەرکووك باو بووەو لە ئاهەنگە گشتی‌یەکانا ووتارو شیعر خوێندراوەتەوەو هەڵپەرکێ‌و بینراوی بچووك‌و ساکاری تەمسیلی پیشان دراوە .. ئینجا لە سالی ( ١٩٤٧ ) بـــە دواوە باسی کاری هونەری‌و شانۆگەریمان بۆ ئەکاو ئەڵێ :

لەم سالانەدا کە مامۆستا ( شاکر فەتاح ) لە چەمچەماڵ قائمقام بوو ، زۆر هەولی ئەدا بۆ پێش خستن‌و بەرزکردنەوەی رادەی هونـەری‌و ئـەدەبی . توانیمان شانۆگەری ( مەم‌و زین ) پێشکەش بکەین کە خەڵـکێکی زۆر لە کەرکووکیشەوە هاتبوون بۆ سەیر کردنی ، رەزامەندی خۆیان پیشاندا ، هەر وەها لە سالی(١٩٤٨)دا۔ شانۆگەری (نوشتەو جادوو) مان خستە سەر شانۆ کەرەخنەیەکی بە هێز بوو بۆ سەر نەریتێکی نالەباری ئەوسا ، لـە ســـالی (١٩٤٩)دا۔شانۆگەری‌یەکمان پیشان دا بە ناوی(منم میکرۆفۆن)کە لە شێوەی ئیستگەیدا زۆر باش نەریت‌و کردەوە ناشیرینەکانی ناو کۆمەلی شــیتال ئەکردەوە شالاوی بۆ ئەبردن .

لە سالی (١٩٥٢)دا۔ئۆپەرێتی (گولی خوێناوی)م دەرهێنا بۆ سەر شانۆ، هەر وەهـا وەکو دەرهێنەرێك‌و ئەکتەرێك لە ســالی (١٩٥٥)دا۔ چیرۆکی

شانۆگەری ( دلداریو پەیمان پەروەری )ی مامۆستا هەوریم ئامادە کــردو پێشکەش خەلکی چەمچەماڵو دەورو پشتیمان کرد .

لێرەدا مامۆستا شاکر فەتاح ئەڵێ: « لە ساڵەکانی دووای پەنجاوە کاتێك لە ئاکرێ بووم ، هەوڵێکی زۆرمدا بۆ بلاوکردنەوەی گیانی هونەریو ئەدەبی لە ناوچەکەدا ، ئەوە بوو لە (١٩٥١)دا ــ لە یانەی مامۆستایان هەندێ بینراوی تەمسیلی بچووكو ساکارمان ــ بە پێی توانا ــ پێشکەش کرد ، هــەموو هەفتەیەك شانۆگەرییەکمان پێشکەش ئەکرد کە هەمووی بریتی بوون لــە هێرش بردنە سەر دەرەبەگایەتیو نەریتی چەوتی ناو کۆمەڵو زۆر داریو پێ شێل کردنی مافی مرۆڤایەتی ، کە ئەمانەو باس کردنیــان لەو ســەردەمەدا بەسەرکێشیو تاوانێکی گەورە ئەدرایە قەلەم چ جای ڕاوەستان دژیان ..

هەر لەم ساڵانەدا شانۆگەری ( مەمو زین )و ( داد پەروەران )مــان بە عەرەبی پیشکەش کرد ، چونکە دانیشتوان باش لە شێوەی ســۆرانی نــە ئەگەیشتن .

مامۆستا ئەڵێ : لە (١٩٥٥ــ١٩٥٦)دا ــ کە گەڕامەوە ئاکرێ توانیم تیپە تەمسیلییەکە زیندوو بکەمەوەو زۆر شــانۆگەری تر پێشکەش بکەین بــە خەڵکی ئەو ناوچەیە .. هەر وەها لە شەقلاوەش ئەم بزووتنەوەیە لە ســاڵانی دوای (١٩٥٣) وە لە برەوابوو ، لە یانەی فەرمانبــەران زۆر ئــاهەنگی تەمسیلیو گورانیمان بە کوردی پێشکەش کرد » ...

دێینەوە سەر باسی شاری سلێمانی کە بەمەلبەنــدی بزووتنــەوەی هونەری کوردی دا ئەنێین ، بە تەماشاکردنێکی سەر پێیی بەسەر مێژووی هونەری ئەم شارەدا ئەبینین کە هونەر لەم ساڵانــەدا زەنگی بــە سۆزی کاروانی گرمەی ئەهاتو زایەڵەی لە مێشکی خەڵکا دەنگی ئەدایەوە .

لە دوای ســــاڵەکانی پەنجاوە لاوە پێگەیشتووەکانمان دەستیان کرد بە گۆڕینی هەندێ شانۆگەری جیهانیو عەرەبی ،بەتایبەتی نووسراوەکانی شکسپیرو یوسف العانی ، زور شانۆگەری (کۆمیــدیو تراژیدی) لــەم سەردەمەدا پیشان درا..

ئەوە بوو لە ساڵی ( ١٩٥٠ــ١٩٥١)دا ــ لە سینەمای رەشــید چیرۆکە

شانۆگەری یەکەی شکسپیر (هاملت) لە لایەن مامۆستـایان قادر دیلانو ئەمین شەوکەتو ڕوبێنو هەندێکی ترەوە پێشکەش کرا .

ئینجا قوتابخانەی ناوەندی شەو هاتە کۆڕی مەیـدانی هونـەرەوەو سوار چاکی قوتابی یەکانی لەم بارەیەوە هەرگیز لە بیر ناچێتەوەو لێهاتوویی خۆیان لەم ساڵانەدا سەلماند بە پیشان دانی شانۆگەری (سەری گلۆلەکە)ی مامۆستا عانی و (کلۆلان)ی هیگۆلە ساڵی (١٩٥٢)دا ،کە مامۆستا ( کامەران موکری) و هاوڕێکانی زۆر بە جوانی ڕێکیان خست. دوا بە دوای ئەمانە ( بوونە خەلیفە بە خەیاڵ ) پێشکەش کراو تاقە شانۆکەی سلێمانی ئەوسـا (شانۆی قوتابخانەی ناوەندی سلێمـانی) بـووە مەڵبـەندی ئـەم کارە هونەری یانەو زۆری تریش.

قوتابی یانی ئەم قوتابخانەیە بەشی زۆری ئەو پـارەیەی دەستیـان ئەکەوتـیان ئەتوانم بڵێم هەمووی ـتەرخانیان ئەکرد بۆ لە کۆڵ کردنەوەی (قیست)ەکانی سەرشانی قوتابی یە هەژارەکانی ئەم قوتابخـانەیەو کڕینی کەلو پەلی پیویست بۆیان ،کە ئـەم کارە هەمیشـە شوێنی شـانازی و سەربەرزی یەو بەڵگەیەکی بە هێزە بۆ یەك بوونو بەهانا چوونی یەکترەوە هەر بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزەشی بوو کە لەساڵی(١٩٥٤ــ١٩٥٥)داـشانۆگەری ( جەنابی موفەتیش ) پیشان دراو ئەکتەرەکانی عبـداللە میدیاو خالد کریمو ئەمین شەوکتو نەوزاد سائیب و حەمە سەدیقی پارێزەر)و هەندێکی تـر بوون.

نەبێ ئەم قوتابی یانە بەمەوە وەستابن ، بەڵکو لە سـاڵەکانی دوای ئەمەشدا شانۆگەری یان لە سەر شانۆ پیشان ئەداو بەدەستووری ئەوسـا شانۆگەری یەکی گەورەو یەکێکی کورتیان پێشکەشی ئەکرد .. ئەوە بو لە ساڵی ١٩٥٦ دا (عوتەیل)ی شکسپیر لە نواندنی (نوری وەشتیو عزیز ئەمینو تەها خەلیلو کەمال الدین توفیق .. )و زوری تر پیشان دراو شـانۆگەری ( ئافرەتو نوشـتەی ) کاك کامیـلیش لەگەڵیـا پێشکەش کـرا کـە ئەکتەرەکانی بریتی بوون لە خالە عەزیز عەزیز صالحو حەسەن تەنیاو هەندێ برایانی تر .. ئەم دوو شانۆــ گەری یە بۆ ماوەی هەشت ڕۆژ لە سەر هۆڵی

قوتابخانەی ناوەندی کوڕان لە سلێمانی پێشکەشی کرا ،لە ١٢/٣هـەتـا ٢٠/٣/١٩٥٦ ، دەرهێنەری هەر دوو چیرۆکەکەش ( ئەنوەر توفی ) بوو .



« عوتـەیـل »
سـالی ١٩٥٦

دانیشتووەکان :

١ ــ جەمال ئەحمەد
٢ ــ کەمال الدین حاجی توفیق
٣ ــ عەزیز مەحمود بەگ (خاڵە)

وەستاوەکان :

١ ــ عوسمان قادر
٢ ــ حەسەن تەنیا



**« ئافرەتو نووشـــتە »**
**ســـالی ١٩٥٦**

**ئەکتەرەکانی :**

| | |
|---|---|
| ١ ـ عەزیز مەحموود بەگ ( خاڵە ) | : مەلا |
| ٢ ـ حەسەن تەنیا | : ئافرەت |
| ٣ ـ عەزیزی سالحی زەرینی | : ئافرەت |

هەر لەم ساڵانەدا ، واتە لە سالی (١٩٥٦)دا ـ (کۆمەلی هونەرە جوانەکان) لە سلێمانی هاتە کۆڕی مەیدانی هونەری کوردی‌یەوە،و بۆ یەکەم جـار لە مێژووی هونەری کوردی‌یا کۆمەلێکی هونەری لە سەر یاسای تایبەتی‌و بە شێوەیەکی ڕێك و پێك هاتە دی ، ئەوەی ڕاست بێ ـوەکو کاك نەجاتی عەبدە ئەلێ ـچەندسالێك پێش ئەمە ئەندامانی (تیپی موسیقای مەولەوی) ئەیان ویست ئەم کۆمەڵە بهێننە دی، هەر ئەمانیش بوون کە بوونە ئەندامە سەرەکی یەکانی کۆمەڵ .. هەر لە گەڵ دامەزراندنیا شانۆگەری ( پیسکەی

تـــەر پـیر )ی ، لە دەرهێنـــــانی ( رفیـق چـــالاك ) پێشــــکەش کرد ،وە ماموستا چالاكو دلشاد مەسرەف هاوبەشی نواندنیان کرد... لــە هەمان کاتا لە گەل ئەم شانۆگەری یەدا ئۆپەرێتی (گول کۆی تازەی لەیل) پیشکەشی کرا ، کە نوسینی ئەحمەد بەگی کۆماسی یە ، گۆرانی نواندنی حەمە سالح دیلانو عبداللە سالار بوو...

هەر وەها ئەم کۆمەڵەوە لە سالی (١٩٥٧)داــشانۆگەری (ووشکە مێ بازی) لە نواندنی دلشاد مەسرەف لە سەر شانۆی بەرێوەبەرێتی پەروەردەی ئێستا پێشکەش کرد ..

ئینجا دووای ئەمانەو لە ســـالی (١٩٥٨)داــ چیرۆکی شانۆگەری تاوانی چی بوو ..؟!)ی پیشانی خەلکی سلیمانی دا کە کاك (رەووف یەحیا) دەری هێنا بوو ، و برایان نەجاتی عەبدەو عەباس توفیقو نوری بەدەویو مەحموود زێوەرو سمکۆ ناکام ــکە ئەوسا منال بوو ــهەر وەهـــا خوشکی بەرێز (نەرمین ناکام) دەوریان تیا ئەبینی..



« تـــاوانی چی بوو ..؟! » ســــالی ١٩٥٨

ئەکتەرەکان :

١ ــ سمکو ناکام (کە بەڕاستی خەوی لێ کەوتووە !!)٠

٢ ــ نەجات عەبدە٠

٣ ــ نەرمین ناکام٠

ئەم شانۆگەری‌یە بە یەکەم شانۆگەری کوردی ئەژمێررێ کە ئافرەتی کورد تیــا چۆتە سەر شانۆ ، بەلکو ئەتوانم بلێیم کە ئەم کۆمەلە بۆ یەکەم جار ئافرەتی کوردی هانداو ڕێی شکاندنی کۆت وزنجیری نالەبــاری دەست کردی نەریتی چەوتی کۆمەلی بۆ خــۆش کــردنو زۆر بە ســەر بەرزی‌یەوە بردنی‌یە سەر شانۆی هونەری کوردی ، خوشکە ئەندامەکانی، وەکو :شیرین رەشیدو بەهیە ئەحمەدو پەخشان حەمە بەگو نەرمین سەعید ناکامو نەجاتی مەحوی ٠٠٠ هەر لە کاتی دامەرزانــدنیەوە هەتا دوا کات هاوبەشی بەرهەمەکانیان کردووەو شان بە شانی براکانیان لە کۆڕی هونەرا لە گەل نەفامیو کۆنەپەرستی‌دا جەنگاون ، وهەمیشەش جێگــەی ڕێــزو شانازیمانن ٠

هەر چەندە من وام ئەزانی ــبەلکو واش باو بوو ــکە یەکەم جــار ئافرەتی کورد لە ( مەموزین )دا سالی ١٩٥٨ ــ ١٩٥٩ کە قوتابی‌یانی ناوەندی شەو پێشکەشیان کرد ، سەرشانۆی دیوەو بەشدار شــانۆگەری کردووە کە ئەویش خوشکە ( گولزار عومەر ) بوو ، بەلام دوایی بۆم دەرکەوت کە لــە بە زۆر لاوە کرد بۆ ئەم مەبەستە ، بەلام داخەکەم نەمــان توانی بگەینــە پێش ئەما خوشکانی تر بەشدار نواندنی شانۆگەری‌یان کردووە وەکــو باسمان کرد ٠ بەلام شایانی باسە کە بلێیم بۆ ئەم مەبەستە زۆر هەولم دا ــبۆ روون کردنەوەی مێژووی بەشدار بوونی ئافرەتی کورد لە شانۆگەری‌دا ــلە پێشا ڕووم کردە خوشکە (ناهیدەی شیخ سەلام) کە ئەی گوت گوایا لە سالی (١٩٤٢ــ١٩٤٣)داــ قوتابخانەی ( ئەحــداس ــ احداث ) چیرۆکی تەمسیلی (هەژاری لەکە نیە)ی پیشاندا کە کچان لە تەمــەنی دەو دوانزە ســالان بەرەو خوار بەشــداریان تیاکرد ، دوای ئەوەشــی قوتابخــانەی ناوەندی کچان شانۆگەری‌یەکیان پێشکەش کرد ( کە ناوەکەی لە بیر نیە )و

کچان دەورەکانیان ئەبینی ٠٠٠کەوا بزانم ئەمانە بە سەرەتای بەشدار بوونی ئافرەت دانابزێ لە مێژووی شانۆی کوردەواری‌یا ، چونکە نوابدنەکەیان لە چوار چێوەیەکی تایبەتی‌و بۆ مەبەستێکی تایبەتی زۆر بەساکاری‌و سەر پێرِی پێشکەشی کراوە ، هە روەها خوشکە (بەدیعە دارتاش) یش پەیوەندی ئەنجامێکی روون ٠٠٠

ئینجا کۆمەڵی هونەرە جوانەکان شانۆگەری‌یەکەی ماموستا هەوری (بووکی ژێر دەوار رەشی)ی هەڵبژاردوو لە ساڵی ١٩٥٩ دا پێشکەشی دانیشتوانی سلیمانی کرد کە خوشکە (نەجاتی مەحوی) هاوبەشی کرد ٠

(تیپی موسیقای مەولەوی)ی سەر بەم کومەڵەشی زۆر ئاهەنگی موسیقاو شانۆگەری گێرا ٠٠ئەوە بوو بۆ یارمەتی دانی لێ قەوماوانی لافاوی سلێمانی ئاهەنگێکی شەنگی نواندن‌و مۆسیقای لە ساڵی ١٩٥٧ دا لە هەولێرو سلێمانی‌و کۆیە رێك خست پاش ئەوەی کە پروپاگاندەی بەفرۆکە بلاو دەکردەوەو پارەیەکی باشیان کۆ کردەوە ، سەلماندیان کە هونەر بۆ گەلەو لە پێناوی گەلایە ٠٠



« تیپی مۆسیقای مەولەوی »
١٠-١٠-١٩٥٨

لەم لاشەوە قوتابیەانی قوتابخانەی ناوەندی شەو هــەر لــە كۆڕی هونەرا زەنگی كاروانیان دەنگی ئەدایەوەو لە كارا بوون ٠٠٠ئەوە بوو لە سالّی ١٩٥٨ ــ١٩٥٩ دا و لە سەر شانۆی ناوەندی كوڕانو لە درەهێنانی ( ئەنوەر توفی ) چیرۆكە نەمرەكەی خانی ( مەمو زین ) یان جارێكی تر زیندوو كردەوەو بۆ ماوەی (دە) ڕۆژ ــلە ٢٣/٢هەتا ١٩٥٨/٣/٥ بەردەوام بو ، ئەكتەرەكانی برێتی بوون لە قــادر دیــلان و رؤوف یەحیاو كەمال الدین حاجی توفیقو خوشكە گولزار عومەر و ئەكرەم فەقی مەحموودو حەسەن تەنیاو زۆرانی تر ٠٠



« مــەمو زیــن »
ســــالّی ١٩٥٨ - ١٩٥٩

بەشــدارانی شانۆگەری ( مــەمو زین )

ڕیزی پێشەوە : ( لە ڕاستەوە بۆ چەپ ) :

١ ــ فایەق محمد٠

٢ ــ حەسەن تەنیا٠

٣ ــ ئەكرەم فەقی مەحموود ٠

ڕیزی ناوەڕاست :

١ ــ حسین علی
٢ ــ قادر دیلان
٣ ــ کمال الدین حاجی توفیق.
٤ ــ رەووف یەحیا.
٥ ــ مەحموود زێوەر.
٦ ــ حسین مستەفا

ڕیزی دوواوە :

١ ــ شەماڵ سائب.
٢ ــ ئەنوەر توفی.
٣ ــ ئەمین میرزا کەریم.
٤ ــ کەمال سەلمان .
٥ ــ ئەنوەر حسین جاف.
٦ ــ سەردار عبدالله زوهدی.
٧ ــ عەزیز مەحموود بەگ (خالە).
٨ ــ بەکر حاجی قادر (ڕاساڵ).
٩ ــ بەدیع ئەحمەد .
١٠ــ جەمال ئەحمەد.
١١ــ نوری ئەحمەد.
١٢ــ کامیل حسین.
١٣ــ شیرزاد مەحموود شەوقی
١٤ــ ئەنوەر ئەحمەد

هەر وەها خوشکە (گولزار عومەر) کــە دەوری (زین)ی ئەبینی لــە وێنەکەدا نیە.



**وێنەیەکی تر لە شـانۆگەری**
**« مـەم و زین »**

ئەکتەرەکان :
١- قادر دیلان
٢- حەسەن تەنیا .

لەم ساڵە دا ــ واتە ساڵی ١٩٥٨ ــ شۆڕشی نەمری چواردەی گەلاوێژ لە عیراقا بەرپا بوو، بۆ ماوەیەك ڕێگەی سەختی بۆ هەموو ڕۆشنبیرانو هونەرمەندان خۆش کردو ڕێك خراوە نیشتیمانی یەکان لەم سـەردەمەدا هاتێکی باشی برەو پێ دانی هونەری شانۆیی یان دا .. چیرۆکی شانۆگەری (ژیانی قوتابی لە دەوری کۆندا) (ئەمرەکەی بەگم)ی لە هەمان ساڵدا بـۆ ماوەی (دە) ڕۆژ (لـە ٧/١٠هەتا ١٧/١٠/١٩٥٨)خستـە سـەر شـانۆی قوتابخانەی ناوەندی کوڕان.



« ئەمرەکەی بەگم »
سالی ١٩٥٨

ئەکتەرەکان :

١ ــ رەووف یەحیا.
٢ ــ نەرمین ناکام.

هەر وەها لە سالی (١٩٦٠)یشدا دوو شانۆگەری تری پێشکەش کرد کە (شاکر من دایکتم)ی ماموستا عانی و (بێ ئیشی) بوون.

کۆمەڵێك لە لاوان لە سالی (١٩٥٩)دا شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر) لە نووسینی مامۆستا (کامەران موکری) یان پێشکەش کرد، کامەرانو کەمال الدین توفیقو جەلال وەستا ئەمینو عەزیزی مەحموود بەگو، هەر وەها خوشکان گەلاوێژ سابیر کۆیی‌و پەروین عەزیز بەگو سوعاد سەعیدو زۆری تر بەشداری نواندنەکەیان کرد، ئەم شانۆگەری‌یە بۆ ماوەی (دە) رۆژ لە سەر شانۆی قوتابخانەی ئامادەیی کوڕان بەردەوام‌بو .

گەنجانو لاوانو زۆر ڕێك خراوو دامەزراوی تر ئاهەنگیان ئەگێڕاو شانۆگەری خۆماڵیيان تیاپێشکەش ئەکرد کە زیاتر بە بۆنەی جەژنە نیشتیمانیيەکانەوە بوو ، و زیاتر بۆنی سیاسی لێ ئەهات .

دووای تێك چوونی باری کوردستانی عیراقو هەڵگیرسانی شەڕ لە ناوچەکەدا جمو جووڵی هونەریش کز بوو ...

ئەم سستیيە لە کۆڕی هونەرا بەردەوام بوو هەتا سەرەتای ساڵی ١٩٦٩ و ڕاوەستانی شەڕ لە ١٩٧٠ بە دواوە .

جا لێرەوە ڕێ ڕەوێکی نوێ لە شانۆی کوردیيا دەستی پێ کرد لە لایەن لاوە هونەر پەروەرە پێ گەیشتووەکانی شاری سلێمانیيەوە کە مەردانە بازوویی چالاکیيان لێ هەڵکردەوەو هەوڵێکی بێ شومار درا کە شانۆیکوردی لە سەر ڕێو شوێنێکیتازەو زانستی زیندوو بکرێتەوەو تەرخان بکرێ بۆ خزمەتی گەل ، ئەوە بوو ڕۆژی ٤-٢-١٩٦٩ ( تیپی نواندنو موسیقای سلێمانی ) لە دایك بوو دوای هەولو کۆششێکی زۆر ، دوای ماوەیەك ( تیپی مۆسیقا ) جیا بووەوەو سەر بەخۆ دەستی کرد بە ئیش کردن بە ناوی ( تیپی موسیقای سلێمانی )یەوە پاش ئەوەی کە لێهاتوویيو سەرکەوتوویی خۆی سەلماندو لە زۆر ئاهەنگی تیپەکەدا بەشداری کرد ، مایەوە ( تیپی نواندنی سلێمانی ) کە هەتا ئێستاش بەردەوامە لە پێشکەش کردنی چیرۆکی شانۆیی سەر کەوتوودا کە بەڵگەن بۆ لێهاتوویيو توانای ئەندامەکانی لە بارەی شانۆوە .

وە ئەم چیرۆکە شانۆییو تەلەفیزیۆنیيانەی کە تا ئێستا پێشکەشی کۆمالانی خەڵکی کردوەو بەتێکڕایی ئەمانەن :

١ ـ گیسك نیە بزنە ـ منالی تەمەڵ ـ باودژن ـ لە گەل ئاهەنگی موسیقاو گۆرانی لە ٢/٢٦ هەتا ١٩٦٧/٣/٤ لە سلێمانی.

٢ ـ ئاهەنگی جەژنی کرێکاران لە ١٩٦٩/٥/١دا لە سلێمانی

٣ ـ شانۆگەری (سەرینی باداری) لە٧/١هەتا ١٩٦٩/٧/١٠لە سلێمانی

٤ ـ شانۆگەری (سەرینی باداری) لە٧/٢٠ هەتا١٩٦٩/٧/٢٩ لە هەولێر

٥ ـ شانۆگەری (بلیمەت) لە١١/١هەتا ١٩٦٩/١١/٨ لە سلێمانی

٦ ــ شانۆگەری (گۆڕ هەڵگەن) لە١٦/٢ هەتا٢٥/٢/١٩٧٠ لە سلێمانی
٧ ــ شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر) ڕۆژی ٢١/٣/١٩٧٠ لە هۆڵی خولد لە بەغدا
٨ ــ شانۆگەری (لە سێبەری دڕکا) لە ١/٨هەتا ١٢/٨/١٩٧٠ لە سلێمانی
٩ ــ شانۆگەری (لە شێتخانەدا)و (مەکری ژنان) لە ٢٧/٩هەتا ١٠/١٠/١٩٧٠ لە سلیمانی
١٠ــ شانۆگەری (قلیشایەوە) لە ٢٠/١٠هەتا ٣٠/١٠/١٩٧٠ لە سلێمانی
١١ــ شانۆگەری (نرخی ئازادی) لە ١/٧هەتا١٠/٧/١٩٧١ لە سلێمانی
١٢ــ شانۆگەری (نرخی ئازادی) لە١/٩ هەتا٥/٩/١٩٧١ لە هەڵەبجە
١٣ــ شانۆگەری (پیری ئاخر شەڕ) لە١/٩ هەتا٩/٩/١٩٧٢ لە سلێمانی
١٤ــ شانۆگەری (کۆتایی زۆردار) لە٥/٧ هەتا١٢/٧/١٩٧٣ لە سلێمانی
١٥ــ شانۆگەری (چاوی کوردستان) ڕۆژی ١٧/٦/١٩٧٣ لە یانەی فەرمانبەران لە سلیمانی
١٦ــ شانۆگەری (مانگرتن) لە ١/٥ هەتا٨/٥/١٩٧٥لە سلێمانی
١٧ــ شانۆگەری (شاخەوانی مەزن) ڕۆژی ٢٥/٢/١٩٧٤لە هۆڵی خولد لە بەغدا



**لە بەرهەمەکانی « تیپی نواندنی سلیمانی »** ــ نرخی ئازادی ــ

که له سلێمانیو هەڵەبجە پێشکەش کرا •
و له ساڵی ١٩٧٢ دا له تەلەفیزیۆن تۆمار کرا •
شانۆگەرییە تۆمارکراوەکانی ئەم تیپە لە تەلەفیزیوندا برێتین لە:

| | |
|---|---|
| ١ــخوا لە سوڵتان مەحمود گەورەترە | رۆژی ١٩٧٠/٣/٢١ تۆمار کران |
| ٢ ــ مشتەی ناو هەمانەکە کوشتومی | رۆژی ١٩٧١/٢/١٢ تۆمار کران |
| ٣ ــ دەوەن بە ئاش | رۆژی ١٩٧٢/٢/٧ تۆمار کران |
| ٤ ــ مەکری ژنان | رۆژی ١٩٧٢/٤/٤ تۆمار کران |
| ٥ ــ لە چایخانە دا | رۆژی ١٩٧٢/٩/٥ تۆمار کرا |
| ٦ ــ تاوان | رۆژی ١٩٧٣/١/٦ تۆمار کران |
| ٧ ــ دڵۆپێ خوێن | رۆژی ١٩٧٣/٦/٢٣ تۆمار کرا |
| ٨ ــ نرخی ئازادی | رۆژی ١٩٧٥/٧/٢٤ تۆمار کرا |
| ٩ ــ قەیسەرت لە بیر نەچێ | رۆژی ١٩٧٦/١/١٢ تۆمار کرا |

١٠ــ بازرگانی شەڕ
١١ ــ هاوڕێو نیو
١٢ ــ ئافرەتی داوێن پاك
١٣ ــ من کێم
١٤ ــ پیری ئاخر شەڕ
١٥ ــ دزی زۆر زان
١٦ ــ کۆتایی زۆر دار
١٧ ــ فیلەکەی خاوەن شکۆ
١٨ ــ شەمامەو خاڵ خاڵ

ئەم تیپــە بێ پشوودان بەردەوامە لە کۆڕی هونەری شــانۆییدا بۆ پێشکەش کردنی شانۆگەری سەرکەوتوو و پتەو کردنی بناغەی شــانۆی کوردەواریمان •• هیوام پێشکەوتنو سەرکەوتنیەتی •

ئینجا ( کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی ) لە ٣١ــ١٢ــ١٩٦٩دا ــ لــە سلێمانی دێتە کۆڕی دڵسۆزانەوەو ئازایانە چاکی ئیش کــردنو خزمــەت

کردنی لێ ئەکا بە لاداو سەرەڕای پەرەپێدانی شـانۆو لایـەنەکانی تـری هونەر وەکو ( وێنەو موسیقاو گۆرانیو وێنەی فوتۆگرافی ) هـەر وەهـا لایەنە ئەدەبی‌یەکان ، وەك شۆڕە سوارێکی لێ هاتووی مەیدانی هونەر وە لە ماوەی کورتی دەست کردنیا بە ئیش ، توانیویەتی (لق) لە زۆر شوێن بکاتەوە لە کوردستاناو سەر پەرشتی هەموویان بکاتو ئاڕاســـتەیان بکات بەرەو هونەرێکی کوردی پاكو خزمەت گوزار .

ئەم چیرۆکە شانۆگەری‌یانەش زادەی بیرو مێشـــكو ماندوو بوونی ئەندامەکانیەتی لە مەلبەندی گشتی لە سلێمانی :

١ ــ کێـــج ســالی ١٩٧٠ لە سلێمانی
وە لە هەمان سالا لە هەولێر دوو بارە کرایەوە .
٢ پێنج کەس لە ئوتێلێکا سالی ١٩٧٠ لە سلێمانی
٣ ــ شایی خوێناوی سالی ١٩٧١ لە سلێمانی
٤ ــ جەنابی موفەتیش سالی ١٩٧١ لە سلێمانی
وە لە هەمان سالا لە بەغدا پێشکەش کرا
٥ ــ شێخی تەپلە ڕەش سالی ١٩٧١ لە سلێمانی
٦ ــ گەلۆر سالی ١٩٧٢ لە سلێمانی
٧ ــ ئوتومبیلچی سالی ١٩٧٢ لە سلێمانی
٨ ــ پیسکەی تەڕپیر سالی ١٩٧٢ لە سلێمانی
وە لە هەمان سالا لە هەولێر دوو بارە کرایەوە .
٩ ــ پژمین سالی ١٩٧٣ لە سلێمانی
١٠ــ چاوی فیتنام رۆژی ٤ــ١٠ــ١٩٧٢ لە کەرکوك
١١ــ چالی جەرگی پیرێژن سالی ١٩٧٢ لە بەغدا
١٢ــ ئۆپەریتی گولی خوێناوی سالی ١٩٧٢ لە بەغدا
١٣ــ ئاپار سەرکەوتنە سالی ١٩٧٣ لە سلێمانی
١٤ــ دیوار رۆژی ٢٦ــ٢ــ١٩٧٤ لە میهرەجانی بەغدا
١٥ــ ئاهەنگی سەرەتای سالی ١٩٧٦ کە (٣) سێ شانۆگەری تیـــا پیشان درا :

أ ـ جووتيارو زەوی •
ب ـ خوازبێنی ( لە نووسینی ماکس رینیە ) •
ج ـ هەڵەی دوکتۆر

هەر وەها بەرهەمە تەلەفیزیۆنی یەکانی مەڵبەندی گشتی لـە سـلێمانی بریتین لە :

١ ـ کێچ مانگی مارت ١٩٧١ تۆمار کرا •
٢ ـ پێنج کەس لە ئوتێلێکا رۆژی ١٠ـ٧ـ١٩٧٠ تۆمار کرا •
٣ ـ جەنابی موفەتیش رۆژی ١١ـ٩ـ١٩٧٢ تۆمار کرا •
٤ ـ تاوانێك لە ئاسمانا رۆژی ١٤ـ٢ـ١٩٧٣ تۆمار کرا •
٦ ـ بلیتو زاوا رۆژی ١٤ـ٢ـ١٩٧٣ تۆمار کرا •
٧ ـ پیسکەی تەڕ پیر رۆژی ٩ـ٢١ـ١٩٧٢ تۆمار کرا •
٨ ـ پژمین رۆژی ٢ـ٤ـ١٩٧٣ تۆمار کرا •
٩ ـ چاوی ڤێتنام رۆژی ٧ـ١٠ـ١٩٧٣ تۆمار کرا •
١٠ـ ساراخان رۆژی ٦ـ١ـ١٩٧٤ تۆمار کرا •



« پیسکەی تـەڕ پـیر »

لە بەر هەمەکانی کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی ـ مەڵبەندی گشتی ساڵی ١٩٧٢ لە سلێمانیو هەولێر پێشکەش کراو لە هەمان ساڵدا لە تەلەفیزیۆن تۆمار کرا

بێ گومان کۆمەڵ بەم بەرهەمانەوە نەوەستاوە، بەڵکو پەنجەی ڕەنگینو بیری پاکی هونەرمەندەکانی زاخاوی مێشكو دەروونی خەڵـکیان بە گەلێ بەرهەمی سەرکەوتوانەش داوەتەوە •

( تیپی پێشـــــــــڕەوی شانۆی کوردی ) ڕۆژی ٢١ــ٨ــ١٩٧٣

چاوی هەڵهێنا ، لــە ســـــەرەتای ئیش کردنیەوە ویستی لە پلەیەکی ئاکادیمی هونەریی بەرزا ئیشو کــاری خۆی بــەرێ بەڕێوەو توانی تــا ماوەیەکی باش لەمەدا سەر بکەوێو ڕۆشنبیرییەکی هونەری زۆر پێشکەش بەئەندامەکانی بکات ، ئەم ڕاستییەش لەو بەرهەمە شانۆییانەدا دەر ئەکەوێ کە تا ئێستا لە سەرشانۆو پەردەی تەلەفیزیۆن پێشکەشی گـــەلی کوردی کردووە ، بەرهەمەکانی ئەم تیپە ساوایە برێتین لە :

١ ــ زیانی توتن لە سلێمانی مانگی تشرینی دووەم ١٩٧٣
٢ ــ چەخماخە لە سەر شانۆی بزووتنەوەی هونەر لـــە سـلێمانی کانونی یەکەم ١٩٧٣
٣ ــ دوا گۆرانی لە سلێمانیو بەغدا تشرینی یەکەم ١٩٧٣
٤ ــ پردی وولات لە میهرەجانی بەغدا مارت ١٩٧٤
٥ ــ ڕەجەبو پیاو خۆران لە سلێمانی تەمموز ١٩٧٥

لە ستۆدیۆکانی تەلەفیزیۆنیشا دەستێکی باڵای هەبووە لە پێش خستنی چمو جوولی هونەری نواندنا ، سەرەڕای زۆر گیرو گرفت توانیویەتی ئــەم بەرهەمانە پێشکەش بکات :

١ ــ لانەوازان مانگی ئاب ١٩٧٣ •
٢ ــ زیانی توتن مانگی تشرینی دووەم ١٩٧٣
٣ ــ چەخماخە مانگی کانونی یەکەم ١٩٧٣
٤ ــ پاڵتۆ مانگی ئادار ١٩٧٦



**بەشـــدارانی شـــانۆگەری**
**« چەخماخـــە »**
**لە بەرهەمەکانی ( تیپی پێشرەوی شانۆی کوردی ) ســـاڵی ١٩٧٣**

ئەمە سەرەڕای ئەو کۆڕە هونەری‌یانەی کە هەندێ لە ئەندامەکانی ئەم تیپە گرتوویانەو لایەنەکانی هونەریان ـ بە تایبەتی هونەری شـــانۆیی ـ بۆ لاوان ڕوون کردۆتەوە ، هەر وەها یارمەتی تیپەکانی تریشیان داوە ...

* * *

بێجگە لەو تیپانەی کە باســـمان کردن هەندێ تیپی تریش لە کۆڕی هونەری شانوگەری‌یا دڵسۆزی‌و لێهاتوویی خۆیان بۆ گەل دەر بریوەو زۆر چیرۆکی شانۆگەری باشیان پێشکەش کردووە ، چ لە سەر شانۆ چ لە سەر پەردەی تەلەفیزیۆن ... وا بزانم ئەگەر بەرهەمەکانی، هەموویان ناو بەرین کاتێکی زۆرمان لێ داگیر ئەکات ، کاتیش وەکو ئەڵێن . لە ئاڵتوونە ، لە بەر

ئەوە تەنیا ناوی ئەو تیپانە ئەبەین ، لە گەڵ ڕێزو سـلاومانا بۆ هەسـتو دلسۆزییان لە تێکۆشانا •

١ ـ تیپی هونەری کارگەی جگەرەی سلێمانی •
٢ ـ تیپی هونەری نەقابەکانی کرێکاران لە سلێمانی •
٣ ـ تیپی هاورێیانی گەزیزە •
٤ ـ تیپی لاوانی سلێمانی •
٥ ـ تیپی یەکێتی قوتابییانی کوردستانی عیراق •
٦ ـ تیپی شانۆی پەروەردە •
٧ ـ تیپی هونەری یەکیتی ماموستایانی کوردستان لە سلێمانی •
٨ ـ تیپە شانۆییەکان لە قوتابخـانەکانا ( کوڕانو کچـان ) کـە مەڵبەندی چالاکی قوتابخانەکانی سەر بە بەڕیوەبەریتی پەروەردە سەر پەرشتییان ئەکات ، وە لـە زۆر کـاتو میهرەجانا ڕووی ڕوشنی هونەرەکەمانو تواناو لێ هاتوویی خۆیان پیشان داوەو مایەی شانازی بوون •

وەکو بیستمان نیاز وایە بەم زووانە تیپێکی هونەری تر بێتـە ریـزی کاروانی هونەری کوردییەوەو بە ناوی ( تیپی هونەری گشتی )یەوە کـە هیواداری دوا ڕۆژێکی ڕوونم بۆی ••



ئێمە لێرەدا کە شاری سلێمانی دائەنێین بە مەڵبەندی بزووتنەوەی شانۆی کوردی ، دانیش بەوەدا ئەنێین کە لە شارەکانی تری عیراقا ئـەم هونەرە توانیویەتی ـ سەرەڕای هەمو دەردە سەرییەك ـ تا ڕادەیەکی باش ڕێگـە ببڕیتو ببێتە قوتابخانەیەکی کاریگەری باش بۆ گەڵو ئارەزووی خەڵـکی لە زۆر لاوە بجووڵێنێ ••• ئەوەی توانیمان دەسـتمان بکەوی لە بـارەی زانیاری ئەم هونەرەوە لەو شارانەدا ، وا لێرە دا پێشکەشی ئەکەین ، لە گەڵ ڕێزو سلاوی دلسوزیمانا بۆ هەموو ئەو برا هونەرمەندانەی دەسـتی

یارمەتی‌یان بۆ درێژ کردووم‌و دڵسوزی‌و هونـەرمەندێتی خۆیان سەلماند •
یارمەتی هەستی پاکی ( نەقابەی ماموستایانی کوردسـتان )و (بەڕێوەبەرێتی لاوانی سلێمانی )م هەرگیز لەیاد ناچێ لەم بارەیەوە •••

لێرەوە گەشتێکی هونەری‌یانەمان کرد بە شارەکانا بۆ کۆ کردنەوەی زانیاری لە بارەی شانۆو شانۆگەری کوردی‌یەوە، لەو شارانەدا ـسەرەڕای تۆفوکڕێوەو زوقمی زستان‌و گڕەی هاوین • بـەو هیوایە کـــە بتوانین سەرچاوەیەکی مێژوویی بۆ شانۆی کوردی دابنێین ، خۆ ئەگەر بە تەواویش نیشانم نەپێکابێ ، مایەی شانازی‌یە بۆ من کە دەرگایەکی فراوانم خستۆتە سەر پشت بۆ هەموو هونەر دۆستێك کە لێوەی بچێتـــە ژوورەوەو بەڕابەری ئەم نووسینەمان گەشتی خۆی لە باخچەی هونەرابکاو گوڵی گەشـاوەی شانۆگەری کوردیش بکا بە سەر سنگی هەموو هونەرمەندێك‌و دڵسۆزی شانۆداو بیسەلمێنێ کە کورد خاوەن هونەرە •••



# هونـەری شـانۆگەری کوردی


# شــارەکانی تــردا



## (( بەغـــدا ))(*)

شاری بەغدای پایتەخت هەرچەندە لە زۆر کۆنەوە مەڵبەندی زانست وهونەرو ڕۆشنبیری بووە ، لە هەمان کاتا ئاواتی هونەرمەندەکانمان بووە کە بتوانن هونەری شانۆیی کوردیمان بە دانیشتوانی ئـەم شــارە بناسێنن بەتایبەتیو چونکە زۆر شانۆی خاوەن ئامێری هونەریو ڕێكو پێکی تیایەو زۆربەی قوتابیی‌یە کوردەکانیش بۆ تەواو کردنی خوێندنی زانیاریو هونەری ڕووی تێ‌ئەکەنو شارەزایی لە بارەی شانۆوە پەیدا ئەکەن ..

لێرەدا هەندێ لەو کارە شانۆیی‌یانە ئەخەینە بەرچاو کە لاوە هونـــەر دۆستەکانمان لەم شارەدا پیشانیان داوەو سەلماندوویانە کە شانۆی تینووی پێشکەوتنو بەرزی‌یەو کوردیش خاوەنی بەهرەی هونەری خۆیەتی .

لێرەدا نامانەوێ ناوی ئەو شانۆگەری‌یانە دووپات کەینەوە کە تیپـــە هونەری‌یەکانی سلێمانیو شارەکانی تر لە بەغدا دا کردوویانەو لە کاتی خۆیدا ناومان بردوون ــ یان ناویان ئەبەین ــ ، لە بەر ئەوە خۆمان لە ســـاڵەکانی

---

(*) سەرچاوەکانم بۆ ئەم باسە :

١ ــ کاك ئەحمەد سالار .

٢ ــ کاك ئەژی گۆران .

٣ ــ کاك ئەحمەد دەنگ گەورە .

(١٩٥٧)ی ــزاییندا ئەبینینەوە کە ڕێگە بە (یانەی سەرکەوتنی کوردان) درا کە تیپێکی هونەری بە ناوی ( کۆمەڵی ئاوازی کوردی )یەوە دابمەزرێنێ ، لــە مانگی شوباتی ئەو ساڵەدا کۆمەڵ پێك هات کە ئەندامەکانی برێتی بوون لە هونەرمەندان :

شەماڵ سائیبو تەها بابانو ئەحمەد دەنگ گەورەو عوسمان عوزێری و حسین قەرەداخیو ئەژی گۆران ، ئەم کۆمەڵە توانیان لە هەمان ســاڵا ئاهەنگێکی شەنگ ڕێك بخەنو چیرۆکێکی شانۆی بــە ســێ پــەردە لەو ئاهەنگەدا پێشکەش بکەن بە ناوی ( ژیانی قوتابی لە بەغدا )(*) کــە جێی ڕەزامەندی خەلکی بوو ...

کاك ئەژی ئەڵێ ئەمە یەکەم شانۆگەری کوردی بووە کە لە بەغـــدا پیشان بدرێ ... بەڵام مامۆستا ( جیهان شاوەیس ) ئەی ووت :

ئێمە کاتێك کە قوتابی بووین لە کولیجی فرۆکەوانی ســـاڵی ١٩٥٦ ( درۆموڤیل )ێکی بێ دەنگمان لە سەر شانۆی کۆلێجەکە پێشکەش کــرد کە لە ژێر ناوی ( دەرەبەگ )دا ــ بوو .



« ژیانی قوتابی لە غەریبایــەتی »

(*) کاك ئەحمەد دەنگ گەورە ئەڵێ : شانۆگەرییەکە نــاوی ( ژیانی قوتابی لە غەریبایەتی ) بوو .

بەرهەمێکی شانۆیی ( کۆمەڵی ئاوازی کوردی ) بوو لە نووسـین و دەرهێنانی ( ئەحمەد دەنگ گەورە ) •

مانگی نیسانی ١٩٥٧ لە سەر شانۆی هۆڵی گەل لە بەغدا پێشکەش کرا•

**ئەکتەرەکان :**

١ ــ حسین قەرەداخی •
٢ ــ تەها بابان •
٣ ــ محمد نوری عارف •
٤ ــ ئەژی گۆران •
٥ ــ عوسمان عوزێری •

ئینجا قوتابی‌یە کوردەکانی ئامۆژکە و ئاکادیمیەی هونەرە جوانەکانی بەغدا بەو پەڕی دلسۆزی‌و لێهاتوویی‌یەوە شانیان دایە بەر قورسایی‌وگرانی ئەم هونەرەو توانی‌یان لە زۆر موناسەبات‌و ئاهەنگا شـانۆگەری کوردی پیشان بدەن‌و توانای خۆیان لەم بارەیەوە بسەلمێنن •

دوای هەوڵێکی زۆر توانرا تیپێکی هونەری بهێنرێتەکایەوە بە ناوی ( تیپی قوتابی‌یانی هونەر )ەوە کە زۆربەی ئەندامەکانی قوتابی‌ی ئامۆژگەو ئاکادیمیەی هونەرە جوانەکان بوون ، لە ساڵی (١٩٧١)وـبە بۆنەی یـادی شاعیری نەمری کورد (گۆران)ەوە لە سەر شانۆی (ساطع الحصری) ئـەم تیپە توانی (١٢) تابلۆ لە شیعرەکانی ماموستا گۆران ئامادە بکاو پیشانی بدات•لەم تابلۆیانە:

أ ــ بووکێکی ناکام•
ب ــ گوڵی خوێناوی•
ج ــ جق‌وتق•
د ــ بنی‌بیر•
هـ ــ من ئەو دیلەم••• هتد

هەروەها ئەم تیپە توانی لە هەمان ساڵا شانۆگەری (نەفرەت لێ کراو) لە تەلەفیزیۆندا تۆمار بکات ،کە ڕێبازێکی تازە بوو لە قوتابخانەکانی شانۆ...



« نەفرەت لێ کراو »

**یەکێك بوو لە بەرهەمەکانی ( تیپی قوتابی‌یانی هونەر ) ڕۆژی ١-٤-١٩٧٠**
**لە سەر شانۆی کۆلێجی پەروەردە لە بەغدا**

بەهاوکاری ئەم تیپە لە گەڵ تیپی نواندنی لقی کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی لە بەغدا و تیپی هونەری کۆمەڵی ڕۆشنبیری کوردی ؛ توانرا لە ساڵی ١٩٧٠– ١٩٧١ دا میهرەجانێکی شانۆیی کوردی لە سەر شانۆی هۆڵی ( ساطع الحصری ) لە بەغدا ڕێك بخەنو ئەم چیرۆکە شانۆگەری‌یانە پێشکەشی بکەن:–

أ – من مرۆڤم.
ب – قوبووڵ.
ج – خۆیەتی.
د – سەربەرزی(لە نووسینی ئەحمەد تاقانە)

ئینجاو له سالی (١٩٧٤)دا گەورەترین میهرەجانی هونەری لە مێژووی هونەری کوردی‌یا گیرا ، له کاتی خۆیدا باسی هەر یەکێك لە بەرهەمە شانۆیی‌یەکانی ئەم میهرەجانە ئەکەین کە هەموو تیپە هونەری‌یەکانی کوردستانی عیراق تیاندا بەشدار بوونو بۆ هەموو لایەکیان سەلماند کە کورد خاوەنی هونەری خۆیەتی‌و هونەریش بۆ گەل تەرخان ئەکرێت ، هەر وەکو یەکێك لە دروشمەکانی میهرەجان ئـەی ووت : « ئاوازەکانمان تابلۆکانمان ..شانوگەری‌یەکانمان له پێناوی هێنـانە دی ئاواتی مرۆڤی کوردایە ».





((قەلا دزێ* ))



شارە ماتو ئارام گرتووەکەی قەلادزێ کە لە باوەشی قەندیلو ئاسۆسدا ئێستا خەوی لێ کەوتووە ، لە دێرزەمانەوە شوێنی ئاهەنگو رابواردنو بەزم بووە...

بۆ مەبەستی ڕوون کردنەوەی سەرەتای بزووتنەوەی هونەری شانۆگەری لەم شارەدا ، ڕوومان کردە کاك (حەمەی ئایشێ) ـ کە بە باشترین ئەکتەری کومیدی میللی ئەژمێررێ لە ناوچەکەدا ـ ئەویش زۆر بە کارامەیی باسی ئەو شانۆگەری‌یانەی بۆ کردین کە بە زۆری لە بۆنەکانا پێشکەشیان کردووەو خەلکی ناوچەی قەلادزێ‌یان فێری بینینی شانۆگەری کردووە ، هەر چەندە ئەی ووت کە ئەم هونەرە لێرە تازەیەو مێژوویەکی دووری ئەو تۆی نیە تا بۆی بگەرێینەوە ، بەلام ئەی ووت بیستوومە لە دەورو بەری سالەکانی بیستا خەلك سەیرانو ئاهەنگی گەورە گەورەیان کردووەو هەندێ بینراوی شانۆگەری ساکارو سەر پێ‌یی‌یان پیشانی ئەو خەلکە داوە ، وەکو لە بیریەتی باوو باپیرانی گوتوویانە کە لەم ئاهەنگانەدا (مام بەکر) ـ کە ئێستا گۆشت فرۆشە ـ ئەبوو بە پاشاو فەرمانی دەرئەکردو ، وەزیرو دەستو پێوەندەکانی ئەنجامیان ئەدا...

هەر وەها ئەی ووت لە هەموو شەوارە ئاهەنگە بچووکەکانی مالاندا هەندێ کەس خۆیان ئەگۆرِیو لاسایی هەندی گیان لەبەر شتو مەکی ناو کۆمەلیان ئەکردەوەو دیمەنەکانی ناو خەلکی ئەو ناوچەیەیان بە شێوەیەکی ساکار پیشان ئەدا.

ئیتر لەمە بەو لاوە ـ لەو باوەڕەدایە ـ کە هیچ شانۆگەری‌یەك ـ وەك

---

(*) ئێمە (قەلادزێ) بەڕاستتر ئەزانین لە (قەلادزە) ، چونکە ـ وەکو لە دانیشتوانیمان بیست ـ لەوانەیە ئەم ناوە لە (قەلای دووزێ)وە هاتبێ.

هونەرێکی سەربەخۆ ــ نەبووەو نەبینراو ، ئەو برایانەی کە بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیمان پێوە کردن ــ بەتایبەتی (غەفووری خالە سمایل) کە هاورێی منالیو گیانی بەگیانیی کاکە حەمەیە ــ ئەمە بەراست ئەزانن‌و دلنیان لە وەی کە هیچ بزووتنەوەیەکی هونەری لە ناوچەکەدا هەتا شۆرشی چواردەی گەلاوێژ نەبووە ، ئەوەش زیــاتر هۆیەکەی ئەگێرنــەوە بۆ ئــەوەی کــە ناوچەکە مەلبەندێکی باشی رژێمی دەرەبەگایەتی بووە، رێگای ئەوە نەئەدرا کە خەلکی ناوچەکە بە هیچ کلۆجێ چاو بکەنەوەو لە ژیانی خۆیان بگەن...، هەتا بیستمان کە زۆر جاری وا بووە دەرەبەگێك کردنەوەی قوتابخانەی لە ناوچەکەیا قەدەغە کردووە ، زۆر جار ئازاری ئــەو کەســانەیان داوە کــە بەرهەلستی رژێمەکەیان کردوون‌و سەرپێچییان لە فەرمانە ناڕەواکانیــان کردووە.

کەچی مامۆستا خالد دلێر ئەلێ : لە سالی ١٩٤٤ دا لە ژێر چاودێــری مامۆستا محمد توفیق ووردی دا ئاهەنگێك لە قەلادزێ رێكخــرا ، لەو ئاهەنگەدا شانۆگەرییەکی بچووك نیشان درا کە ناپاکی برادەر بەرامبــەر بە هاورێکەی پیشان ئەدا...

کاکە حەمەش ئــەی ووت کە دوای بەرپا بوونی شۆرشی چواردەی گەلاوێژ و کزبوونی دەسەلاتی زۆر داری ، بەیارمەتی (موحەمەدی میرزا رەحیم ) لە سالی ١٩٥٨دا چیرۆکی شــانۆگەری ( کەرو لال )مان پێشکەش کرد ، لە هەمان سالا شانۆگەری (ئاغاو نۆکەر) پیشان درا کە خوالێ خۆش بوو (هەمزە حەسەن)بەشدار تیا کرد ..بــەلام بــۆ رۆژی دوایی دەنگی زولالی کپ کرا ...!

( رەشی گامێشی خۆر ) چیرۆکێکی شانۆگەری سەرکەوتوو بوو کــە لاوەکانی قەلادزێ لە سالی (١٩٦٠)دا‌ــ پێشکەشیان کرد، لەهەمان سالا لە سەنگەسەر دووبارە کرایەوە ، ئەکتەرەکانی ئەم شانۆگەرییە برێتی بوون لە ( حەمەی ئایشیو غەفووری خالە سمایلو خوالێ خوشبو خــدرە لۆسو عەلی مستەفاو خالد رەشید کە دەوری ــ پاشــی ئەبینی ،هەر وەها کاك بەکر عەلی چاخان).



**حەمەی ئایشێو غەفووری مام سمایل**
**لە بینراوێکی شانۆگەری‌یا لە قەلادزێ . ساڵی ۱۹۷۲**

ئینجا لە ساڵی ۱۹٦۲ دا ئەم لاوە خوێن گەرمانە شانۆگەری (شەوی کۆتایی)یان پیشاندا کە (نوری حەمە سەعیدو حاجی رەزا عەبدولاو عوسمان مەحموود میرزا و محمد رەزا عەبدولا)و زۆری تر هاوبەشی‌یان تیاکرد ،لێرەدا کاکە حەمە ئەڵێ کە من بە تەنیا شانۆیی (موسیقاری بێ ناوو نیشان)م هەر لە گەل ئەو شەوی کۆتایی‌یەدا پێشکەشی کرد.

هەروا کاکە حەمە ئەڵی شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر) لە هەموو جەژنێکی نەورۆزا دوو بارە کراوەتەوە پیشانی خەڵکی دراوە.

لە دەورو بەری ساڵی(۱۹٦۵)دا۔ شانۆگەری ( حەماڵی تەوەزەل ) کە لە دانانی کاکە حەمە خۆی بوو لە دێی (گردمەیتەر ) پیشان دراو خەڵکێکی زۆر بینی . هەر وەها لە دێی ( بەستێن )و لە ساڵی (۱۹٦۵ــ۱۹٦٦)دا ــ چیرۆکێکی شانۆگەری‌یان پیشاندا (کە ناوەکەی لە بیر نیە) ،کەبرایان (سەردار توفیق‌و حەمەی ئایشێو عەلی سەعید ــکە دەوری کچی ئەبینی* ــوبەکر عەلی چاخان بەشداری‌یان کرد.

(*) هەتا ئێستاش ئافرەت نەچۆتە سەر شانۆ تا بەشداری شانۆگەری‌یەکان بکات.

له ساڵەکانی (١٩٧٠)دا_ شانۆگەری‌و ئاهەنگ لە قەڵادزی‌و دەوروپشتی بەردەوام بووە ،بەڵام داخەکەم چ کاکە حەمـەو کاك غەفوور و ئەوانی تریش ناوەکانیان لە بیرچۆتەوە ، بەڵام ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە بەشی زۆری _یان ئەتوانم بڵێم هەمووی _بۆنی سیاسی لێ هاتووەو بە بۆنە نیشتیمانی‌و نەتەوەیی‌یەکانەوە کراوە•

لێرەدا کاکـە حەمـە ئەڵێ : داخەکـەم لەم مـاوەیەدا هیـچ جۆرە یارمەتی‌یەکمان نەبوو ، یەکێك نەبوو هەست بە پیروزی‌ی هونەرەکەمان بکات‌و دەست گیرۆییمان بکا ، کاك غەفووریش لە مەدا پشت گیری قسەکەی ئەکات‌و ئاخی بێزاری‌و نارەزایی هەڵ ئەکێشێ•

بەڵام لەگەڵ ئەوەشا هەر شانی تەمەڵی‌یان بۆ دانەداوەو کۆڵیان نەداوە، ئەوە بوو لەساڵی (١٩٧٢)دا_لە گەڵ کاك غەفووردا بە جووتە شانۆگەری (پیرەژنی حیلەباز)یان داناو پێشکەشـیان کرد ، هـەر لـە هەمـان سـاڵا شانۆگەری (دزی جانەوەر)یانـ کردە دیاری دەستیان‌و دوای دەرهێنـان‌و ئامادە کردنی بۆ سەر شانۆ پێشکەشی دانیشتوانی ناوچەی قەلادزێیـان کرد •

(یەکێتی قوتابی‌یان)لە قەلادزێ‌و هـەر لە ساڵی (١٩٧٢)دا_ چیرۆکی شانۆگەری ( چاڵی جەرگی پیرەژن ) یان پێشکەش کرد کە ( غەفووری خالە سمایل‌و فؤاد مستەفاو ماموستا عومەر کەمال‌و عەلی سەعید)و هەندێکی تر هاوبەشی‌یان تیا کرد •هەر لەو ساڵەدا شانۆگەری (گەلۆر) یان پیشاندا کە مامۆستا ( جەعفەر )و هەندێکی تر بە شداری‌یان تیاکرد •

ئەم ئاهەنگانە جەماوەری قەلادزێ‌و دەوروپشتی زۆر بە دڵخۆشی و هاندانەوە ئەیان بینی‌و پێ خۆشـحاڵی خۆیان دەر ئەبڕی بەرامبەریـان • هەر وەها لە ( رانیــە )ش زۆر ئاهەنگ‌و چیرۆکی شـانۆگەری کراوە بـە مناسەبەتە نیشتیمانی‌و نەتەوەیی‌یەکانەوە •

لە ساڵی (١٩٧٣)دا _ کومەڵێك لە سلێمانی‌یەوە هـاتن بۆ قەڵادزێ‌و ئاهەنگێکی گەورەو شەنگیان لە قوتابخانەی (ئاسۆس) گێرا کە کاك ئەحمەد دەنگ گەورەیان لە گەڵ بوو•

دوای ئەمەو هەتا ئێستا بزووتنەوەی شانۆگەری کز بوو ونەمـــا ، سەرەرای ئەوەی کە هونەرمەندی بەتواناو لێهاتووی باش لە قەلآدزێ ئەبینرێ کە چاوەڕێی ئەوەن دەست بدرێتە باڵیـــانو بۆ خزمەتی گەلو نیشتیمان تەرخانبکرێن ...





«کۆیە»*



شارە خنجیلانەکەی (حاجی) •• لە دەورو بەری سالەکانی (١٩٠٠)داـ بریتی بوو لە چوار گەڕەکی سەرەکی:

( قەلات ــ بایز ئاغا ــ بەفری قەندی ــ هەواو )

دەستووری ئەوسا هەر گەڕەکە سەیرانی خۆیان کردووەو بۆ ماوەی (٧) حەوت ڕۆژ دەهۆڵو زوڕنایان لێ داوەو هەلپەرکی ویاری ئەو سەردەمەو بینراوی بچووکی نواندنیان پێشکەش کردووە ، لە ئاهەنگانەدا گـەڕەکی قەلات (مەعرووف سۆتەر)یان ئەکرد بە پاشــاو جلەوی بەڕێــوە بــردنی ئاهەنگەکەیان ئەدا یە دەست ،ئەویش ــ هەر وەکو لە سلێمــانی باو بووە ــپاشایەتی خۆی جێگیر کردووەو مافی زەوت کراوی داوەتەوە دەسنت خاوەنیو بە تەواوی خوو ڕەوشتی پاشای پیشــان داوە ، چونکە باش ئەیزانی کە ئەگەر بێتو پێ‌بکەنێ یان لە هەیبەتی خۆی کەم بکاتەوە لێدانێکی باش ئەخواو خەلکی ئازاری ئەدەن •••

بەرێز کاك (میرزا محمد امین حاجی قادر)لەم بارەیەوە ئەلێ: ئــەم مەعرووف سۆتەرە جارێکیان (حەمە ئاغا)ی بانگ کردوو ( ٢٠٠ ) مەجیدی

---

(*) یارمەتی دەرانم لە شاری کۆیە بەرێزان :
١ ــ ئەنورە مەمەد تاهیر
٢ ــ میرزا محەمەد ئەمین حاجی قادر.
٣ ــ رۆستەم فەتاح حوێزی.
٤ ــ عەبدول رەحمان ئیسماعیل (ئەورەحمان ڕووتە).
٥ ــ حاجی سۆفی رەسوڵ ...
٦ ــ حوسامەدین تەیب. و زۆر بەرێزو دلســۆزی تر بوون .

لێ سەند بۆ خەرجی سەیرانو ئاهەنگەکەیان ،حەمە ئاغاش زۆر بە دڵ فراوانی‌یەوە پارەکەی‌دا ... هەر وەها ئەڵێ کە (مەحموودە فەندی) هەبوو ،تابوور ئاغاسی عوسمانی بوو ئەمیش (٥) پێنج لیرەی لێ سەندرا ...

سەیرانەکان زیاتر لە (ئەسحابان) ئەکراو حەوت شەوو حەوت ڕۆژ ئاهەنگ‌و بەزم لەوێ بەردەوام بوو ،زۆر جاریش ئاهەنگ‌و سەیران لە دێی ( هەر مووتە ) ئەکـرا ، گەڕەکەکانی تریش یەك لە دووای یەك ئەچوون بۆ سەیرانو توانای هونەری خۆیان لە ئاهەنگەکانی ئەم سەیرانـانەدا دەر ئەبڕی ...

میرزا حەمە ئەمین ئەڵێ کە گەڕەکی بایز ئاغاش کاك (فیض الله (فەیزە) یان ئەکرد بە پاشاو وەزیرو دەست‌و پێوەندیان بۆ دائەنا .

لەو سەیرانا نەدا بینراوی تەمسیلی‌یان پیشان ئەداو هەندێك ئەبوون بە (دێو) پەلاماری (پەری‌یان)یان دەداو ئەیان فڕاندن‌و زۆر بە ڕێك‌و پێکی دەورەکانی خۆیان ئەبینی ..

هەر وەها لەو سەردەمانەدا وا باو بووە لە شـایی‌یەکانی ئاغاکاندا هەندێ بینراویان پیشانی شایی کەران داوە ، وەکو پاشا پاشاو میر میرێن‌و بووك‌و زاواو سوار سوارانێ و زۆر شتی تری وا کە توانای هونەرمەندێتی خەڵکی ئەم شارەی دەر بڕیوە ..

ئاهەنگەکانی نەورۆزو (کاوە) هەر لە مێژەوە بەردەوام بووە ، هەر وەها زۆر جار نواندنی تریشیان پێشکەش کردووە ، بەتایبـەتی ئۆپەرێتی (گوڵی خوێناوی)ی‌ـ مامۆستا گۆران کە ووتیان لە ساڵی (١٩٣٨)داـ کراوە، بەڵام دوایی بۆمان دەرکەوت کە ئەم ئۆپەرێتە هەرگیز نەمرە لـە سـاڵی (١٩٤٨)داـ کراوەو (جەمال کەریم حەمە مەلا )دەوری ئافرەتی تیـا بینیوە ، هەندێ جاریش لەم سەردەمـەدا کاك (عارف رەووف) دەوری کچی لە تەمسیلەکانا ئەبینی.

شانۆگەری ( کچی کوردستان ) لە ساڵی ( ١٩٣٤ــ١٩٣٥)داـ بەهاندانی (عبدالخالق قطب ) پێشکەش کرا کە ( جەمال عەبدوڵا ) و ( عومەر عەبدوڵا) دەوریان تیا ئەبینی ، لە هەمان ساڵا لە شاری هەولێر دووبارە کرایەوە ، بەڵام

پێش ئەمە ـ وەکو لەمەو پێش باسمان کرد ـ و لە سالی (١٩٣٣ـ١٩٣٤)داـ چیرۆکی شانۆگەری ( نیرۆن ) لە کۆیە پێشکەش کراوە ، کـــە چی کـاك ڕۆستەم فەتاح حەوێزی ئەڵێ ئەم چیرۆکە لە (١٩٣١ـ١٩٣٢)داـکراو (عومەر عەبدولآ )و ( سەید نەزیف ) بەشداری‌یان تیا کردو لە هەمان ســـاڵیشا لـە هەولێر پیشان درا .



« زوحاك و کاوە »
سالی١٩٧٢
ئەم شانۆگەری‌یەلە نەورۆزی هەموو ساڵێکدا هاوبەش بووە
لە شاری کۆیە .

کاك حوسام الدین طەیب ئەڵێ : یەکەم ئاهەنگی نەورۆز لە کۆیە ،
لە سالی ١٩٤٤و لە ( ئۆمەر خوچان )دا ـ کراوە

هەر وەها کاك ( ڕۆستەم حەویزی ) ئەڵێ : لە جەژنی قوربانی ســـالی (١٩٢٨)داـ شیعری (کوردی ستەم دیدە )م بە شیوەی نواندن خوێندەوە لە ئاهەنگێکی ئەو جەژنەدا کە زۆر کاری کردە سەر خەڵــکی و زۆر کــەس

گریان...هەروا ئەڵێ : لە ساڵانی ( ١٩٣٣ــ١٩٣٤ )دا ـ کە شافە (دیدەوان) بووین‌و لەو کاتەدا لە قەڵادزێ‌و رانیە شانۆگەری ( شۆرش ) مان پێشکەش کرد ... ئەم شانۆگەری‌یانەش زیاتر قوتابی‌یانی قوتابخانەکان پێشکەشیان ئەکرد ...

لە پێش ئەم مێژووانەشدا کابرایەکی قسە خۆش‌و دونیا دیدە هەبوو کە ناوی ( عەبدولا جەیدی ) بوو ، ئێواران لاوەکانی کۆیەی کۆ ئەکردەوەو لەو دەشتە سەیران‌و هەڵپەرکێ‌و گۆرانی‌و بینراوی تەمسیلی‌یان کردووە لە گەڵ فەقێ‌یاندا بە شێوەیەکی ساکارو سەر پێ‌یی‌و بۆ کات بردنە سەر .

لە پێش پەنجاکانا لە چایخانەکان بینراوی تەمسیلی‌و شانۆگەری ئەکراو پیشانی خەڵــکی ئەدرا ، وەکو ( سەرتاش زۆر بلێ )و ( پیرۆت قــەرەنی )و ( کچی بە زۆر بەشو دراو )و (پیری ئاخر شەڕ )و ( میری زۆردار )و زۆری تر کە زۆر جوان رێك ئەخران‌و خەڵکی شەو گاریان پێ ئەبردە سەر..،بەڵام دوای پەنجاکان هەندێ شانۆگەری سەرکەوتووی رێك‌و پێك سەری هەڵدا، وەکو ( خانزاد خانی سۆران ) لە ساڵی (١٩٦٠)دا ــ کە کاك رۆستەم خۆی و شەعب حسام‌الدین‌و جەمال حسین‌و مەجید ئەحمەدو زۆری تر دەوریان تیــا بینیوە ، هەر وەها چیرۆکی شانۆگەری ( بێگانەیەك مەیدانە )ش لە ســـــاڵی (١٩٦١) دا ..

لێرەدا مامۆستا حاجی سۆفی رەسوڵ ئەڵێ لە ســاڵی ( ١٩٦٨ ) بەدواوە توانیمان برێك شانۆگەری ســــەرکەوتو پیشانی جــەماوەری کۆیــەو دەوروپشتی بدەین ، وەکو ( ئاخرشەرِی پیاوی دووژنە )و چیرۆکە نایابەکەی مامۆستا عەلادین سوجادی ( شێرێ ژنی کوردو پیاوی بێ ئەمەك ) کــە لــە دوواییدا بە شێوەی چیرۆك لە ( رشتەی مرواری ) دا ــ بلاو کرایەوە ، ئــەم چیرۆکە هەر لەو ساڵە دا (١٩٦٨) کردمان بەشانۆیی‌و لە قوتابخانەی (زانست) پێشکەشمان کرد کە کچ دەوری ئافرەتی بۆ یەکەم جار لە سەر شانۆتیابینی ، هەر وەها شانۆگەری ئەنجامی قوتابی زیرەك‌و تەمەڵ )و ( عفریتەی عەیار)و زۆر شانۆگەری تر کە جێی رەزامەندی خەڵکی بوون .

لەو کاتانەدا هەندێ لاوی دلسۆزی هونەر پەرست ئەرکو قورسایی باری گرانی هونەری شانۆیی‌یان خستبووە سەر شانیان کە هەمیشە شایانی ڕێزو سوپاسمانن .. لەوانە برایان : ( چەتۆ رەووف )و ( مستەفا ڕەسوڵ )و ( حەمە بگرەز )و ( حەمە عەلی حەمە لاو )و ( عومەر ســـادق )و ( عەزیـز مەحموود )و ( عبدالرحمن ڕووتە )و (حسام الدین طیب )و ( پارێـزە یونس رەووف )و ( سیروان عبدالرحمن )و (رزگار ڕووتە )و (سەلاح ئەسـعەد ) ، هەر وەها خوشکان ( سەباحەت عزیز )و ( کوردستان عومەر ) ...و زۆری تر کە لە ناو چوار چێوەی (تیپی تەمسیلی کۆیە)دا ــ جمو جوولی هونەری‌یان پەرەپێداو سەرنجی خەڵکیان بۆ تواناو لێ هاتوویی خۆیان ڕاکێشا .

( لقی کومەڵی هونەرو وێژەی کوردی ) لە سالی (١٩٧٤)دا ــ لە کۆیــە کرایەوەو لە سەرەتاوە دەستیان دایە پەراوە کردنی زۆر چیرۆکی شانۆگەری، بەڵام داخــەکەم فریای ئەوە نەکەوتن کە پێشکەشیان بکەنو ئەندامــەکانی پەرەوازە بوون ، وە هەتا ئێستاش گەڵو پەلیان ماوە ...

قوتابخانەکانیش لەم ڕووەوە کەمتەرخەمی‌یان نەکردووەو لــە هــەمو مناسەباتێکی نیشتیمانیو نەتەوەییدا ئاهەنگی تەمسیلی‌یان ئامادەو پێشــکەش کردووە .

هەر وەها ( تیپی موسیقای باواجی کۆیە )ش شـــانۆگەری‌یەکی لە تەلەفیزیۆن تومارکرد ( ناوەکەیمان لە بیر نیە ) کە بەداخەوە ئـــەڵێین زۆر سەرکەوتوو نە بوو ، وە لە ڕیزی لێ هاتوویی ئەندامەکانیا لە مەیانی موسیقاو گۆرانی‌یا نەبوو ...





## « هەولێر* »



شارەدێرینەکەی کوردستان لە ڕێڕەوی هونەری شـانۆگەری‌یا زۆر بەباشی بەرەو پێش تەکانی داوەو شان بەشانی شـارەکانی‌تری کوردستان لە کاروانی هونەرا زایەڵەی زەنگی سەرقافڵەیی لە ڕیزەکانی پێشـەوە دەنگ ئەداتەوەو ئاوازی شیرینی هونەری کورد بە گوێی گەلا ئەچرپێنێ .

یەکەم کەس کە بە بیرمانا هات بۆ ڕوون کردنەوەی مێژووی هونەری شانۆیی هەولێر مامۆستا ( گیو موکریانی ) بوو کە ئەی‌ووت :

جەژن‌و ئاهەنگەکانی نەورۆز هەمیشە مەشـخەڵ بووەو ڕێ ڕەوی گەلەکەمانی ڕووناك کردۆتەوەو سەرەرای هـەموو هـەوڵ‌و توانایەکی جەندرمەکانی میری سەردەمی سەدەی نۆزدەهەم دەنگی بەسـۆزی بەرەو ئاسمان ئەکشاو مژدەی ئازادی ئەهێنا ... لە سەرەتادا ئەم بیرەوەری‌یە پیرۆزەمان لە ماڵی ( سەیدۆك )دا بەدزی‌یەوە یاد ئەکردەوە وئاهەنگمان بۆ ئەکرد ، لەوێدا شـیعرو ووتارو بینراوی شانۆییمان تیا ئەکرد ، و یەکێکیش چاودێری ماڵەکەی ئەکرد لە ترسی پۆلیس‌و پیاو خراپی ئەو سەردەمە..دوای ئەوە چووینە قەراغ شارو لەناو دەغڵ‌و شوێنی نەدیدەدا ئاهەنگمان سـاز ئەکرد، بەڵام زۆر جار ئەکەوتینە بەر شەپۆلی قین‌و ڕقی جەندرمەکانی میری‌ی ئەوسا ..

(*) ئەرکێکی زۆرمان دایە بەر ئەم برایانە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی شانۆی هەولێرەوە ، کە شایانی هەموو ڕێز وسوپاسمن:
١ ـ ماموستا گیو موکریانی.
٢ ـ سەباح عبدالرحمن.
٣ ـ یوسف بولص.
٤ ـ هوشیار سەید ئەحمەد.
٥ ـ خەلیل یابە.
٦ ـ محەمەد حەویز.

ئینجا ورده ورده توانیمان بەئاشکرا ئەم جەژنە مەزنە یاد بکەینەوە و تەمسیلی گەورەو ڕێك‌و پێکی تیادا بکەین کە جەماوەرێکی زۆر ئەیبینی و زۆر جاری وابووە کە شار چۆڵ بووەو هەتا زۆر جار نەخۆشیش هاتووە بۆ بینینی ئاهەنگەکان •

لێرەدا مامۆستا موکریانی باسی نەریتی پاشاپاشاو حوکم کردنمـــان بۆ ئەکا کە بەو شێوەیەی لە سلێمانیدا هەبوو •• یەکێك ئەکرا بە پاشـــاو کلاوێکی قووچیـــان لەسەر دائەنا کە هەندێ زەنگوولەی پێوە کرابوو ، و یەکەم مەرج ئەوە بوو کە پاشا نابێ پێ‌بکەنێ ؛ ئەگینا زۆر باش لێیان ئەدا ، هەروەها وەزیرەکانی جل‌و بەرگی سەیریان لەبە ئەکردو ولەشیان بەزەنگوولە دائەپۆشراو لەکاتی ڕۆیشتنا ئەم هـــەموو زەنگوولەیە دەنـــگی ئەدایەوە وهاڕەی لێوە ئەهات‌و خەڵکیش بەهەڵپەرکێ‌و ئاهەنگ‌و یاری‌و بەزمـــەوە کاتیـــان ئەبردە ســـەر ، مامۆســـتا ئەڵێ ئەم نەریتـــە لە ناوچەی موکریانیش ــ دەوروپشتی سابلاخ ــ باو بووە •

هەروەها ئەڵێ : لە ساڵەکانی دووای (١٩٣٠) چیرۆکی شـــانۆگەری ( سەلاحەدین )مان پێشکەش کرد ، کە پۆلیس ئەو سەردەمە وەك هـــەڵۆ هێرشی ئەهێنایە سەرمان‌و لێی ئەداین‌و تەمسیلەکەیان قەدەغە ئەکردین، بەڵام ئێمە هەر کۆڵمان نەداو هەر چۆنێ بێ توانیمان لەو سەردەمە پڕ لە تاریکی‌و زۆرداری‌یەدا کارە هونەری‌یەکەمان بە جوانی پێشکەشی خەڵك‌بکەین ، لەم شانۆگەری‌یەو پیاو دەوری ئافرەتی ئەبینی کـــە کاك ئیبراهیم ئیسماعیل بوو دەوری ( جولیا )ی زۆر بە جوانی پیشان ئەدا ، مامۆستا ( محمد حەویز )ئەم ڕاستی‌یە ئەسەلمێنێ‌و ئەڵێ ئەم شانۆگەری‌یەمان لەساڵی (١٩٣٨)داـکرد کە خۆم دەوری سەلاحەدینم وەرگرتبوو ، مامۆستا (موسا عبدالصمد)یش دەوری جێ‌نشینی ئسکوتلندەی ئەبینی •• ئێمە لێرە دان بەوەدا ئەنێین کە بەومـــاوە کەمەی لە هەولێر ماینەوە نەمان توانی زۆر بە ووردی بچینە بنج‌و بناوانی ئەم هونەرەوە لەم شارەدا ، چونکە ئەو ڕوونکردنەوەیەی کە بە چەند ســـاڵێك توانیمان لە سلێمانیدا کۆی بکەینەوە ، هەرگیز ناتوانرێ بە دوو ڕۆژ لـــە شارێکی دێرین‌و خاوەن مێژووی وەك هەولێرا پەردەی تاریکی لەســـەر

لابیرێ ‥ جا کەواتە بەو پەلەپەلی‌یە٘هەر ئەوەندەمان توانی کە بزانین یەکەم شانۆگەری لەهەولێرا ( سەلاحەدین )بوو ٠ کە لە سالی(١٩٣٨)دا۔لاوە خوێن گەرمەکانی گێڕاویانە ، ئەوەی شایانی باسە مامۆستا محمــد حویزیش ئەڵێ ئەم شانۆگەری‌یە یەکەم کاری هونەری شـــانۆیی کوردی‌یە کەلەهـــەولێر پێشکەش کراوە وەك هونەرێکی ســـەربەخۆو مەرجی شـــانۆگەری تیـــا بووبێ*٠

ئینجا کاك (یوسف بولص ) لێرەدا ئەڵێ : سالی (١٩٥٤)دا۔ توانیمان دوای هەوڵ دانێکی زۆر شانۆگـــەری‌یە مەزنـــەکەی شکسپیر(عوتەیل) بخەینە بەرچاوی خەلك ڕادەیەکی هونەری باش تیاسەربکەوین، ئەکتەرەکانی ڕیتی بوون لە هونەر پەروەران مامۆستا(عبدالفتاح عبداللطیف) (سەفوەت جەراح ) ( یوسف بولص ) ( صـــائب رەفعەت ) ( فەتحی مەعسووم )و زۆر برایانی‌تر٠

هەروەها کاك یوسف ئەڵی ئەم چیرۆکە شانۆگەری‌یە لە سی‌یەکانا لە رەواندز پێشکەش کراوە ‥، هەروەها ئەڵێ کەلە سالی (١٩٥٥)دا۔ هەر لە هەولێر دوو شانۆگەری مامۆستا (یوسف العانی)مان پەرچڤەکردوو پیشانی خەلکیمان‌دا ، بەلاّم داخەکەم ناوی شانۆگەری‌یەکانی لە بیر نەماوە ‥٠

بۆ روونکردنەوەی مێژووی شـــانۆی هەولێر لە دوای ئەم ســـالانەوە روومان کردە کاك (سەباح عبدالرحمان)کە بەوپەری لێ‌هاتوویی یەوە باسی ڕێ‌رەوی شانۆی هەولێری بەم شێوەیەی خوارەوە بۆکردین: «بزووتنەوەی شانۆگەری کوردی لە هەولێرا لە سالی (١٩٥٨) بەدواوە بەسترابووەوە بـــە مناسەبەتە نیشتیمانی‌یەکان‌و زیاتر ڕێ‌ڕەوی باری رامیاری ئەوسەردەمەی ئەنواند ، لەو کاتانەدا بەرهەمە شانۆیی‌یەکان زیاتر لە قوتابخانەکاناو لەچوار چێوەی خواســـتێکی تایبەتی‌یا پێشکەش ئەکران بە تایبەتی ( قوتابخانەی

---

(*) ماموستا ( ئەحمەد خواجە ) لەبەرگی سێ‌یەمی (چیم‌دی)دا و لەلاپەرەی ٢٩دا ئەڵێ: ســـالی ١٩٣٠ ماموســـتا حقی الشبلی بەســـەرۆکایـــەتی دەستەیەکی لاسایی ۔تەمـــسیل۔ هات بۆ هەولێرو لە سەربانی دووکانەکانی بەر قەلاّدا تەمـــسیلیان پێشکەشی خەلکی دەکرد .

مامۆستایان )کە مامۆستایان (جواد رەسول)و مامۆستایان (حەسیب رسول)ی برای وەك دەرهێنەرێك‌و ئەکتەرێك ئەم ڕێبازە پیرۆزەیان پەرە پێداو هانی پێشکەوتنی شانۆگەری‌یان لە ناوقووتابی‌یانا ئەدا ، هەروەها مامۆستا (موفید حەسەن کەسرە )ش ، ئیش‌و کاری ئارایشت‌وو دیکۆری ئەبرد بە ڕێوە ، مامۆستا(سەفوەت جەراح)یش دەورێکی دیارو ئاشکرای بووە لەم بارەیەوە.

لەم کاتانەدا وا باو بووە کە شانۆگەری هەمیشە لە گەڵ ئاهەنگی موسیقاو گۆرانیدا پێشکەشی ئەکراو زیاتر چیرۆکی گاڵتە جاڕی‌و بەشێوەیەکی ساکارو بازاڕی پێشکەش ئەکرا بۆ پێکەنین‌و کات بردنە سەر ، خۆ ڕۆژنامە ودام‌و دەسگای راگەیاندن هەر زۆر دوورەو پەرێز وەستابوو لە یارمەتی دانی هونەر وهونەرمەندانـدا ..هەموو ئەو کارە هونەری‌یانەی لە ساڵێکا پێشکەش ئەکران لە سیان زیاتر نەبوو ئەگەر پلەی سەرکەوتوویی‌و مەرجەکانی شانۆیان بەسەرا دابرین ...

بەرهەمە شانۆیی‌یەکانی ئەو سەردەمە زیاتر بەزمانی عەرەبی پێشکەش ئەکران‌و چیرۆکی خۆماڵیش کەم بوو ، بەڵام لە ساڵانی (١٩٦٨) بەدواوە ڕێبازی شانۆ هەنگاوێکی تازەی ناو ڕەوێکی تازەی گرتە بەر ، چونکە دەرچووانی ئامۆژگەو ئەکادیمی‌ی هونەرە جوانەکان لەبەغدا هەستیان بە پێویستی سەرشانیان کردو ئەرکی دروستکردنی تیپی هونەری‌یان گرتە ئەستۆو لەساڵی (١٩٦٩)دا توانرا کە ( تیپی هونەری هەولێر ) بێتەکۆڕەوەو بەپێی توانا هونەرەکانی گەلی کوردمان پێش بخات‌و بەگەلیان بناسێنێ ، ئەو شانۆگەری‌یانەی تا ئێستا ئەم تیپە پێشکەشی کردووە سەرجەم برێتین لەمانە:

١ ــ سکێچی(بێگانە بۆ دەرەوە)کە بەبۆنەی شۆرشی هەشتی شوباتەوە لەسەر شانۆی هۆڵی شارەوانی لە ساڵی (١٩٦٩)داــ پێشکەش کرا .

٢ ــ ( مەسەلەی شەرەف ) لە ساڵی ( ١٩٧١ )داــ بەبۆنەی ڕۆژی ئافرەتانی جیهانەوە پێشکەش کراو بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ .

٣ ــ (فاڵچی) لە ساڵی١٩٧١دا لە هەولێرو موسڵ‌و دهۆك، لەهەمان ساڵا لە تەلەفیزیۆنەوە پێشکەش کرا .

٤ ــ ( مەسەلەی شارێك ) لە ساڵی (١٩٧٢)دا ـ لەهەولێر پێشکەش کرا ٠
لە هەمان ساڵا لە تەلەفیزیۆنا تۆمار کرا٠

٥ ــ (مارەیی)* لە هەولێر ساڵی (١٩٧٢)و لەهەمان ساڵا لە تەلەفیزیۆن
پیشان درا ٠

٦ ــ ئۆپەرێتی ( کاروانی خەبات ) لە نووسینی ( مومتاز حەیدەری ) ئ
ئاوازی عبدالواحد مەرجان) لەساڵی (١٩٧٣)دا ـ لەسەر شانۆ پێشکەش
کراو لەهەمان ساڵا لە تەلەفیزیۆندا تۆمارکرا ٠

٧ ــ (داری ئاوات)لە نووسینی (مەدحەت بێخەو )لەساڵی (١٩٧٤ــ١٩٧٥)
لەهەولێر پێشکەشی کرا٠

٨ ــ (لەپێناوی رووناکی‌یا)ڕۆژی ١٩٧٤/٣/١لەمیهرەجانی هونەری
کوردی‌دا لەبەغداو لەسەرشانۆی هۆڵی نەتەوەیی پێشکەشی‌کرا٠



(( مارەیی ))

**یەکێکە لەبەرهەمە سەرکەوتووەکانی (تیپی هونەری هەولێر)**
**لەسەر شانۆی هۆڵی شارەوانی (گەل) پێشکەشی کرا**
**لەنووسین‌و دەرهێنانی (سەباح عەبدولڕەحمان)٠**

---

(*) ئەوتریّ کەئەم شانۆگەری‌یە ولەگەڵ (مەسەلەی شارێك) بەناوی نەقابەی مامۆستایانی کوردستانەوە لە سەر شانۆ پێشکەشی‌کراو دوایی تیپی هونەری هەولێر لە تەلەفیزیوندا تۆماری کرد.

٩ ــ ( منالّی دارینه ــ) سالّی (١٩٧٥) لەهەولێر پیشاندرا •
١٠ــ ( چلّپــاو ) لە سالّی (١٩٧٢)دا ــ لە هەولێر پیشاندراو لەهەمــان سالّا لەتەلەفیزیۆندا تۆمار کراه

کاك سەباح ئەلّێ: یەکەمجار ئافرەت لە شانۆگەری(مەسەلەی شەرەفدا) چووە سەر شانۆ گە خوشکە(شەوقیە شەوکەت)بوو ، ئینجا دوای ئەو (چیمەن کاوەیس)خوشکێکی‌تر بوو کە پۆتی نالەبــاری کۆمەلّی شکاندو بەشداری چەند شانۆگەریەکی کرد ، هەروەهــا خوشکە(غوربــەت...) گولدانی چەند شانۆگەری‌یەکی‌تر بووە » •

لەم سەردەمەدا تیپی شانۆیی بزووتنەوەی هونەری سەربە بەرێوەبەرێتی پەروەردەی هــەولێر توانیویــەتی چەنــد بەرهەمێکی ڕێك‌و پێك بخــاتە سەرشانۆو گیانی شانۆیی لە ناو قوتابی‌یانا بچەسپێنێ ، وەك :

١ ــ (لەناوبردنی نەخوێندەواری)کە بــەبۆنەی رۆژی قــەلاچۆکــردنی نەخویندەواری‌یەوە لەسەر شانۆی هۆلّی شارەوانی لــە هەولێر ڕۆژی ١٩٦٨/١١/٥ پیشکەشی کراه

٢ ــ (چیرۆکێ بۆ منالّان)لەنووسینی (معاذ یوسف)وەرگێڕان‌و دەرهێنانی (سەباح عبدالرحمان) بۆ ماوەی چوار ڕۆژ لە هەمــان کات‌و شوێنی پێشوودا پیشان درا ، هەروەها ئەم شــانۆگەری‌یە لە کۆنگــرەی دوەمی‌نووسەرانی کورد لە هەولێر پێشکەش‌کراو لەسالّی(١٩٧١)یشدا خەلــکی سلێمانی بینی •

٣ ــ رۆژی ١٤ی گەلاوێژ/١٩٦٨ ، لەســەر شانۆی نەقابەی مامۆســتایان لە شەقلاوە شانۆگەری ( بووتەو چورچە ) پێشکەش‌کرا کەلە چیرۆکێکی میسری‌یەوە ئامادە کرابووه

٤ ــ شانۆگەری (قوتابخانەی لادێ)بەبۆنەی(سالّی پەروەردەی جیهــانی) لەنووسینی حەمە کەریم هەورامی رۆژێ ١٩٧٠/٩/٢١ لەسەر شانۆی هۆلّی شارەوانی پێشکەشی‌کراه

٥ ــ ( کاوەی ئاسنگەر ) شانۆگەرێیە کلاسیکی یەکەی جەژنی نــەورۆز

له ۲۱/ئادار/۱۹۷۰دا لــه گۆڕەپــانی بــەڕێوەبەرێتی نــاو خۆیی پێشکەش کرا •

٦ ــ کۆتایی زۆردار)لەنــووسینیو دەرهێنــانی کاك(سەباح عبدالرەحمان) له ۱۱/ئادار/۱۹۷۱داو لەهەمان گۆڕەپانی پێشو پیشاندرا •

ئینجا له سەرەتای ساڵەکانی ( ۱۹۷۰ )دا ــ کۆمەڵی هونــەرو وێژەی کوردی لقی هەولێر،لەدایك بووو دەورێکی زۆر باشو پیرۆزی لەپەرەپێدانی گیــانی هونــەری له ناو لاوەکانی شــــاری هەولێردا بینیوســــەرتاپای بەرهەمه شانۆییەکانی بەلگــەی لێ هــاتوویيو توانــای هونەرمەنــده ئەندامەکانیەتی سەرەرای هەموو گیروگرفتێك توانیویــەتی تائێســتا ئــەم بەرهەمانه پێشکەش بەجەماوەری کوردمان بکات :

۱ ــ خەملی پەموو ئەیلوول/۱۹۷۲ له هەولێر
۲ ــ گوێزان تشرینی یەکەم/۱۹۷۲ له تەلەفیزیون
۳ ــ خاڵەی ڕێبوار کانونی یەکەم/۱۹۷۲ له هەولێر
وه لەمانگی شوباتی ۱۹۷۳دا له سلێمانی دووباره کرایەوه•
٤ ــ بۆره پیاو تەمموز/۱۹۷۳ له تەلەفیزیون
٥ ــ زاوای گەلحۆ ــ تشرینییەکەم/۱۹۷۳ ــ لەهەولێر
٦ ــ آ ــ لافاو ــ شوبات/۱۹۷٤ ــ له میهرەجانی هونەری کوردی له بەغدا •
ب ــ باران
۷ ــ سەرکەوتن ــ ئادار/۱۹۷٥ ــ له هۆڵی موستەنسریه له بەغدا
۸ ــ هەڵەی دەرهێنەر ــ مایس/۱۹۷٥ ــ له تەلەفیزیون
۹ ــ هونەرو ژیان ــ ساڵی/۱۹۷٦ ــ له تەلەفیزیون
۱۰ــ کۆتی کۆمەڵ ــ له نووسینی خوشــکه ( ریواس جاف )وه ئێســـــتا خەریکی پەراوەکردنن تیایدا ونیاز وایه له تەلەفیزیۆنا تۆمار بکــری •

هەروەها توانیمان که پەرده لەسەر چەند کارێکی هونەریتر هەڵمالین که (تیپی شانۆی لادێ)پێشکەشی جەمــاوەری لادێکانیــان کــردوواەو بیرودەروونی وەرزێرو جووتیارەکانمانیان پێ ئاو داوەتەوه :

١ ــ داس ــ کانونی‌یەکەم/١٩٧٣لە میهرەجانی شانوی لاویّ لە بەغدا
٢ ــ دەنگی تەلەفۆن ــ سالی/١٩٧٤ ــ لەسەر شانۆی کۆمەلی مانگی سوور لە کەرکوك ، لەهەمان سالاّ لە هەولێر دووبارە کرایەوە •
٣ ــ وێنەیەك لە ڕابووردوو ــ حوزەیران/١٩٧٥ ــ لە هاوینە هەواری سەلاحەدین
٤ ــ نەخویندەواری ــ ١٩٧٦/١/١٥ ــ لە سینەمای سیروان لە هەولێر

وەکو بیستمان نیاز وایە بەم زووانە تیپێکی هونەری‌تر لە کۆڕی هونەری کوردی‌یا بێتە ڕیز بەناوی (تیپی شانۆی کوردی نویّ)،هیوادارم کە ببێتە مایەی شانازی هونەری کوردیمان‌و پیش‌کەوتن‌و سەرکەوتنی ئاواتمە •

نامەویّ لێرەدا ڕێك‌خراوو نەقابەو دەزگاکانی تری هەولێر لە یاد بکەم کە هەریەکەیان بەپیّی توانای خۆی کاری هونەری‌و شانۆگەری پێشکەش کردووەو لە گۆڕەپانی هونەری شانۆدا ئەسپیان تاو داوەو سوار چاکی خۆیان سەلماندووە:

بۆ وێنە تیپی لاوان باس ئەکەین کە ماموستا(فەرهاد شەریف)ئەلیّ: لەسالی(١٩٧٠)دا ــ ئەم تیپە شانۆگەری (بووکی پەردە)ی لە هەولێر پێشکەش کرد ، لەهەمان سالاّ لە ڕەواندزو شەقلاوەو هەریر دووبارەی کردەوە ، هەروەها هەمان تیپ،ولە هەمان سالاّ چیرۆکی شانۆگەری (جەنگاوەری شێت)ی لە نووسینی(تەلعەت سامان)و دەرهێنانی(فەرهاد شەریف)پێشکەشی بە دانیشتوانی هەولێر وشەقلاوەو ڕەواندز کرد ، لەسالی (١٩٧١)دا ــ لە نوسینی(برتۆلد برێشت)ی ئەلمانی کاك فەرهاد چیرۆکی شانۆیی(ووتەی بەلیّ•••ووتەی نەء)ی لە هەولێر پێشکەش کرد ، ئینجاو لە سالی (١٩٧٤)دا ــ لە هەولێر پانتۆمیمی(یەکێتی‌نیشتیمانی)ی پێشکەش کردو لە سالی(١٩٧٥)دا ــ لە دهۆك‌و مووسل دووبارە کرایەوە••••

بەلاّم ئەوەی ئەمەویّ بیلێم ئەوەیە کەبە یەکێتی تیپە هونەری‌یەکان‌و ڕێزی هونەرمەندەکان بۆ یەکتری،و دلسوزی‌و لە خۆ بووردن بۆ هونەر ئەتوانین ئەنجامێکی ڕۆشن‌و کاریکەر وەدی بێنین‌و شانۆ بکەینە

ـ نەدەین... هەولێریش لە هونەرمەندی دڵسۆزو لێهاتوو کەمی نیە ..
بەرهەمی بازاڕی وساکار پیشانیخەڵکی تینووی هونەری ئاڕاستەو پاك
نەدەین...هەولێریش لە هونەرمەندی دڵسۆزو لێهاتوو کەمی نیە..





# « کەرکووك »*



داخەکەم ئەو زانیاری‌یەی لەلایەن هونەری شـــانۆیی کەرکووکەوە دەستمان کەوت زۆر کەم‌و کووڕی‌تێــدایە ،چونکە دوای هەوڵدانێکی زۆر توانیمان تەنیا بەرهەمە شانۆیی‌یەکانی ئەم ســـاڵانەی دوایی ـــیـــان بەووردی بیلێین لە شۆرشی(١٤)ی‌ــتەمموز بە دواوەـــڕوون بکەینەوە ...

بەڵام ساڵەکانی پێشووتر سەرچاوەیەکی وامان دەست نەکەوت کەبتوانێ تینوێتی دەروونمان بشکێنێ‌و زاخاوی مێشکمان بداتەوە بەڕوون کردنەوەی هونەری شانۆگەری لەم شارەدا لە ساڵەکانی پێش ئەم مێژووەدا[١] .

تەنیا ئەوەندە هەیە کە لە هەنـــدێ لاوە بیســـتمان ــ خۆشـــمان لەو باوەڕەداین ــ کە پێش ئەم مێژووەش شانۆگەری هەر بووەو توانراوە هەندی بینراوی تەمسیلی شیاو بکرێت چ لە قوتابخانەکاناو چ لـــە نـــاو شارەکەدا . ئەوەی زیاتر بۆمان روون بووەوە ئەوەیە کـــە خەڵـــکی کـــەرکووك زیـــاتر خۆیان بە هەڵپەڕکێ‌و یاری ( سینی‌و زەرف )ەوە خەریك ئەکردو ڕایـــان

(*) کۆشش‌و یارمەتی دانی ئەم برایانەشوێنی ڕێز وشانازیمن:
١ ــ جەلیل زەنگەنە.
٢ ــ خالد دلێر.
٣ ــ نوری هونەر.

(١) بەوهیوایەوەین کە لەدوا ڕۆژا هـــەر دلسۆزێکی‌تر بێت‌و لـــە هـــەموو باسەکەمان زیادبکاو زیاتر لە ئێمە ئەرك بکێشێ وباسەکان روون بکاتەوە، چونکە ئەوەی لەتوانا ماندا بوو ــ وەك هەوڵێك لەم مەیدانەداو بۆ یەکەم جار ــ ئەمەیە لەبەر دەستتانا.

ئەبوارد ... هەروەها میری‌ی ئەو سەردەمانەش ماوەی بزووتنەوەو گەشەکردنی بیرو مێشکی نەئەداو هەموو گرووو هەڵچوونێکی زانیاری‌ی بەزەبری گورزو کوتەك دائەمرکانەوە ..

جا لێرەوە ناچار بووین کە سەرەتای دەست پێ‌کردنی شانۆگەری کوردی لە شاری کەرکوکا بەدوا دوایی ساڵەکانی پەنجا دابنێین‌و ڕوو بکەینە لاوە دڵسۆزەکانی ئەم شارەو داواو ئارەزوومان بخەینە بەردەمیان .

لە ساڵی (١٩٥٧)دا هەندێ قوتابی‌یانی ( کوێت ) هاتن بۆ کەرکوك ، قوتابی‌یەکانی قوتابخانەی ناوەندی کەرکوك ـ لە کاتی بەڕێوەبەرێتی مامۆستا فاتح‌بەگ‌دا ـ پێشوازی‌یان کردن‌و شانۆگەری‌یەکیان پێشکەش کردن‌بە ناوی ( گەشتەوان ـ السائح ) بەزمانی کوردی کە شوێنی ڕەزامەندی هەموولایەن بوو ، بەڵام دوایی کەویسترا درێژە بە پێشکەش کردنی شانۆگەری‌یە کە بدەن، میری لێ‌ی قەدەغە کردن‌و هەڵیان کوتایە سەریان و هەندێکیشیان لێ‌گیراو دام‌و دەزگاشیان داگیرکرا ، ئەم کارە هونەری‌یە هەندێ لە برایان بەسەرەتای شانۆ کوردی دائەنێن لە کەرکوکا، بەڵام وەکو ووتمان ئێمە لەو باوەڕەداین کە لەمەو پێشیش ئەم هونەرە چەکەرەی کردووەو لە ئاسۆی هونەرا سەری لەگەڵ دەرکەوتووەو هەڵهاتووە .

ئینجا کاك نوری هونەر ئەڵێ : لەساڵی ( ١٩٥٩ــ١٩٦٠ )دا ـ ئافرەتانی کەرکوك شانۆگەری‌یەکیان لە کۆبوونەوەیەکدا پێشکەش کرد کە باسی نووشتەو جادوو و ئافرەتی ساویلکە ئەکات ـ کە بەڕای ئێمە ئەو چیرۆکە شانۆگەری‌یە لەوانەیە ( ئافرەت‌و نوشتە ) کەی مامۆستا کامل‌ژیر بووبێ ـ ئەکتەرەکانیشی هەمووی ئافرەت بوون ..

مامۆستا خالد دلێریش ئاگاداری کردین کە لەپاش شۆڕش چواردەی گەلاوێژ ، جگە لەوەی لە هەموو قوتابخانە کوردی‌یەکانی شۆڕیجەو ئیمام قاسم‌و تەپەو گەڕەکەکانی‌تر شانۆگەری لە نێوان قوتابی‌یان‌و مامۆستاکاندا ڕێك دەخراو لە چالاکی قوتابخانەکاندا پیشان ئەدرا .. تیپێکی

هونەری گشتی لە شارەکەدا پێك هێنرا بۆ گۆرانیو هەڵپەرکیو شانۆگەری کوردی ، ئەو تیپە لە هەموو ئەو ئاهەنگانەدا بەشداری دەکرد کــە یەکێتیو رێکخراوە نیشتیمانیەکان لــە شــاری کــەرکووکدا دەیانگێڕا ، و زۆر هونەرمەندی شارەکە ــ لە کوڕو لە کچ ــ تیایدا بەشدار ئەبوون •

ئەو تیپە ناونرا ( تیپی هونەری خەبات ) هەرچەندە تەمەنێکی کورتی هەبوو بەڵام لە ماوەی کارکردنیا توای سێ چیرۆکی شانۆیی نایاب پێشکەش خەڵــکی شارەکە بکاتو هونەر پەروەرێتی ئەندامەکانی بەخەڵکی بسەلمێنێ • ئەو سێ شانۆگەریە کاك نوری هونەر ئامادەی کردبوون بۆسەر شــانۆو دوای دەرهێنانی پیشان درا ، کەئەمانەن :

١ ــ فالچی : ئەم شانۆگەریە لە هاوینی ساڵی(١٩٥٨)دا ــ لەقوتابخانەی شۆریجە پیشان درا کە بیرەکەی بەربەرەکانی قسەی پڕو پووچو هەڵخەتێنەری خەڵــکی دەکرد ، ئەکتــەرەکانی برێتی بوون لەبرایــان ( نوری هونــەرو لەتێنەری خەڵکی دەکرد ، ئەکتەرەکانی برێتی بوون لەبرایان (نوری هونەرو جەوهەرعەبدوولو کەمال بێزارو خوشکە نەجلا شێخ رەووفو خوشــــکە نازەینی بەکر )و زۆری تر •

٢ ــ ژیــان لە دوو دەورا : ئەم شانۆگەریە بێ دەنگ بوو ( پانتۆمیم ) بەبۆنەی جەژنی کرێکارانی جیهانەوە رۆژی یەکی ئایاری ساڵی ١٩٦٠ پیشان درا کە هونەرمەندان ( حەسیب محمد گلیو کەمال کــەڵەمێردو حەمیــــد تاڵەبانیو حەمە سیروانو شێخ رەووف ــ کەدەوری مەلیکی ئەبینی ــ وکەمال بێزار )و زۆریتر بوون کە هاوبەشییان تیاکرد کــــەباسی ژیانی کۆمەڵانی خەڵــکی دەکرد لە دوودەوری پێشو پاشی شۆڕشی چواردەی تەمموزا •

٣ ــ شەوی کۆتایی : لەنووسینی کەمال قەرەداخیو دەر هێنانی کــاك نوری هونەر بووە، بۆماوەی دووشەو ( ١٩ ــ ٢٠ )ی ــ حوزەیرانی (١٩٦٠) پێشکەش کرا،لەپاییزی هەمان ساڵا لە هەولێر دووبارە کرایەوە لەسەر شانۆی



**((فالچی))**

**شانۆگەری‌یەکی سەرکەوتوو بوو لەبەرهەمەکانی (تیپی هونەری خەبات)**

**ساڵی١٩٥٨**

**لە وێنەکەدا کاك (نوری‌هونەر)و خوشکە (نازەنین بەکر) دیارن.**

هۆڵی گەل ، بۆ ماوەی دوو شەو ، شەوێك بۆ پیـاوانو شەوێك بۆ ژنـان ، ئەکتەرەکانی ( کاکە مەم فەخری‌و کەمال کەلەمێردو خوشـکە فـەریدە حەسەن‌و محمد سیروان‌و ئەمین شوان‌و شیرکۆ محمد )و زۆری‌تر بوون .

* * *

ئینجا لێرەدا مامۆستا جەلیل زەنگەنە باسی شانۆگەری ئەم سەردەمەمان ئەکات‌و ئەڵێ : شانۆگەری‌ی ( شەوی کۆتایی ) تیپی لاوانی کەرکووکیش لە ساڵی (١٩٥٩)دا ــ کردنی کە مامۆستا خالد دلێر نووسیبوی ، هەروەها ئەم تیپە چیرۆکی شانۆگەری(کاوەی ئاسنگەر)ی ــ لەهەمو مناسەبەتێکا ــ بەتایبەتی

لەجەژنەکانی نەورۆزا ـ پێشکەش کردووەو لەساڵی(١٩٧٢)یشدا ـ شانۆگەری ( دڕكو داڵ )ی ـ پێشکەشی کۆمەڵ کردووە .. مامۆستا ئەڵێ کەتیپە هونەرییەکانی تریش کەمتەرخەمییان نەکردووەو توانیویانە زۆر شانۆگەری وا پیشان بدەن کە سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێ .. ئەوە بو لە ساڵی (٩٧٠ـ١٩٧١)دا ـ لقی کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی لەکەرکووك کرایەوەو لەساڵی (١٩٧١)دا ـ توانی چیرۆکی شانۆگەری ( کەبابخانەی خولەشەل ) پیشانی خەڵکی بدات کە لە ئامادەکردنی کاك ( جەمیل جێماو )بوو ، لەساڵی (١٩٧٢)دا ـ شانۆگەری ( بەهاری دزراو )ی ـ لەسەر شانۆ پێشکەش کردو لە ساڵی (١٩٧٣)دا ـ لەتەلەفیزیۆن تۆماری کرد .

ئینجا هەر لەساڵی(١٩٧٣)دا ـ ولەشاری چەمچەماڵ شانۆگەری(١ـ٢ـ٣)ی بەبۆنەی نەورۆزی ئەو ساڵەوە پیشان داو لە مانگی نیسانی هەمان ساڵا شانۆگەری ( تێکۆشانی مرۆڤ)ی ـ پیشانیخەڵکی ناوچەی قەرەهەنجیردا ، هەر لەو ساڵەشدا چیرۆکی ( مەرەزە )ی ـ بەسەرکەوتوویی لە تەلەفیزیۆندا تۆمار کرد ...



((مەرەزە))

بینراوێکی (سینەمایی) لە چیرۆکی (مەرەزە)ی

کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی ـ لقی کەرکووك

بەرزترینو جوانترین شانۆگەری کوردی لە میهرجـــانی هونـەری کوردی‌یا لە بەغدا ساڵی ١٩٧٤ (تەڤینەوە) بوو کە کۆمەڵ پێشکەشی کرد و خەڵاتی یەکەمی میهرەجانەکەی پێبڕ بۆ باشترین دەرهێنانو بەرهـــەمو نووسینو ئەکتەرو جێی سەرسوورمانی هەموولایەکی میهرەجانەکە بوو ، بۆ یەکەمجاریش بوو لەمێژووی شانۆی کوردیو کە برای دەرهێنـەر کـاك ( سەلمان فایەق ) هەندی بینراوی سینەمایی تێکەڵ بە شانۆگەری‌یەکە کـرد بوو •

ئینجا کاك جەلیل باسی ( تیپی مەشخەڵ )مان بۆ ئەکاو ئەڵێ کە ئەم تیپە لەساڵی(١٩٧٠)دا ـ دروست بوو، وە شانۆگەری (دایکی شەهید)ی ـ کردە دیاری دەستی بۆ خەڵکی شاری کەرکوكو هەر لەو ساڵەشدا ئەم دیاری‌یەی پێشکەشی خەڵکی شاری سلێمانی کرد ، ئەم شانۆگەری‌یە لە نووســینی کاك مستەفا پەژارو دەرهێنای کاك سەلمان فایەق بوو ، ئەکتەرەکانی بـرێتی بوون لە ( فازیل جافو خوشکە پەروین ئەحمـەدو هەندێ خوشـــکانو برایانی تر •

هەروەها لە هەمان ساڵا چیرۆکی شـــانۆیی ( کۆتایی دەرەبەگ )ی پێشکەش کرد ، کە ئەتوانین بڵێین یەکـــەم شـــانۆگەری بوو زۆر بەی ئەکتەرەکانی ئافرەت بوون ، لە هەمان •• ساڵا لە سلێمانیش پیشاندرا •

دوای ئەوە، لەساڵی(١٩٧١)دا ـ شانۆگەری (یەك)ی ـ لە نەورۆزی ئەو ساڵەدا پێشکەش کرد لە ئامادەکردنو دەرهێنانی مامۆســـتا سەلمان فایەقو نواندنی(غەفوور عـوزێری‌و محمد عبدالرحمـانو خوشکان پـەروینو نەجیبـە )و زۆری‌تر بوون ، هەر لەو ساڵەدا دوو چیرۆکی‌تری پێشـکەش کرد بە ناوی (ژیان ـ کچەلاڵەکە)لە ئامادەکـردنی سەلمان فایەق ونواندنی (فـازیل جـافو جەلیل زەنگەنەو خوشکـەچنوور ئەحمەد)بوو، لەگەڵ (خاکەکەم) لە نووسینو ئامادەکردنی سەلمان فایەقو نواندی هەمان کۆمەڵ بوو • دوای ئەمانەو لەساڵی (١٩٧٣)دا ـ شانۆگەری‌یەکی پێشکەشی بـــە قوتابی‌یانی قوتابخانەی ئامـادەیی چەمی ڕێزانی کچـان کرد لە ژێرناوی (برسێتی)داو شانۆگەری‌یەکی تریشی بۆ قوتـابی‌یەکانی ئەو قوتـابخانەیە

ئامادەکرد کە (خێزانێکی شلەقاو)بوو،و هەموو ئەکتەرەکانی بریتی بوون لە کچە قوتابی‌یەکانی ئەو قوتابخانەیە.

شانۆگەری (هەرچی‌کردی حەسیر کردی)قوتابی‌یە کچەکانی قوتابخانەی ناوەندی یانزەی ئاداری کچان لەژێر سەر پەرشتی ئەم تیپەدا ـ مەشخەڵ ـ لە مانگی ئاب (١٩٧٠)دا ـ پێشکەشیان کرد .

شایانی باسە کە کچانی شاری کەرکووك لە هەموو شوێنێ زیاتر بە پەرۆشەوە بوون سەرکەونە سەر شانۆو دەنگی دەروونی بەسۆزی ئافرەتایەتی‌یان بگەیەنن بە کۆمەڵو بیسەلمێنی کە ئافرەتی کورد سەرەرای ئازایی‌و داوێن پاکی‌و زیرەکی ... هونەرمەندێکی سوار چاکیشە لە رێبازی هونەرو شایانیەتی کە پێی بووترێ ( ئافرەت ) .





## «خانەقین*»



زۆر بەداخەوەم کە نەمتوانی ــ لەبەر زۆر هۆ ــ بەتەواوی بچمە بنجو بناوانی سەرەتای دەست پێ‌کردنی شانۆو شانــۆگەری لەم شارە دلگیرو (ئاوەدان)ەدا ، کە بەڕاستی شارێکی جوان وخنجیلەو پڕ لە میوەو کانگەی خۆشیو دڵفڕێنەو پشتێنی (ئەڵوەن)ی لە پشتا جەڕانووەو پیاوەتی و میوان داری‌ی کردۆتە پیشەی هەمیشەیی بۆ دانیشتوانی.

هەرچەنــدە ، دوای کۆششێکی زۆرو پەیوەندی کردن بە هەندێ برایانەوە بەو تەمایەی بتوانین سەردەمێکی مێژوویی‌ی هونەری شانۆیی لــە شارەکەدا روون بکەینەوە .. بەڵام هێشتا ئەو ڕۆشــناییەمان دەست نەکەوت کە ڕووناکی بخاتە زینــدانی گەنجینەی چاڵ کراوی هونەری کوردی ئــەم شارەوەو لاپەڕەکانی مێژووی ئەم هونەرەمان بۆ یەکالا بکاتەوە. ــــــــــ

لەبەر ئەوە ناچار بووین کە یەکەم هەنگاو لە ســاڵــەکانی(١٩٧٠)وە بنێین چونکە ئەو برایانە پێیان ڕاگەیاندین کە لە پێش ئەم مێژووەدا هیچ بزووتنەوەیەکی شانۆگەری نــەبووە ... کــەچی کاتێــك ماموســتــای هونەرمەند(ئیسماعیل خەیات) مان دی ووتی کە لەپێش ئەم ساڵانەشدا لە قوتابخانەکاندا تەمسیلی ساکار ئەکراو من خۆم لەو کاتانەدا قوتابی بووم‌و ئەو کارە هونەری‌یانەم لە بیرە کە لە قوتابخانەکان ئەیان کرد ، یان هەنــدێ تیپی‌تر ئەهاتن بۆ خانەقین‌و کاروباری هونەری‌یان پێشکەشی ئەکرد.

---

(*) سەرچاوەکانمان بۆ ئەم‌باسە برایان:
١ ــ کاك یونس ئەحمەد وەندی.
٢ ــ کاك نەدیب غەریب.
٣ هونەرمەند ئیسماعیل خەیات.
٤ ــ کاك ناسر حەسەن ... بوون.

هەروەها لە ڕۆژنامەی ( ڕێگای گەل ــ طريق الشعب ) لە ژمارە (٤٦)دا نوسراوە کە شانۆگەری(ئەمرەکەی بەگم)ی ماموستا یوسف العانی لە (١٩٥٨)دا ــ قوتابییان کردیانو مامۆستا عانی خۆی شانۆگەرییەکەی بینی..

هەروەها ڕۆژنامەی ناوبراو لە هەمان ژمارەدا ئەڵێ کەتیپی(تاڤگە) لە سالی (١٩٧٠)دا ــ دروست بوو ..

هەرچەندە لێرەدا کاك ( یونس ئەحمەد وەندی )ش دان بەوەدا ئەنێ کەلە شەستەکانا هەندێ تیپی مۆسیقا وهەلپەڕکێ وشانۆیی هاتوون وکاری هونەرییان بەزمانیتر ــ عەرەبی ــ کردووە ، بەڵام زیاتر ( دەرەبەگەکان ) دەستیان کێشاوە بەسەر ئەو ئاهەنگانەداو تەرخانیان کردووە بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان..

بەڵام ــ هەرچۆنێ بێ ــ لەسالی (١٩٧٠) بەدواوە کە ڕەگی دەرەبەکایەتی لە ناوا هەڵکەندراو گۆڕیان وون بوو ، ڕێکخراوە نیشتیمانییەکانو دەستگای یەکێتییەکان تیپی هونەری تایبەتییان بۆ خۆیان ڕێكخستووە بۆ گێڕانی ئاهەنگو گۆرانیو شانۆگەری...ئەولایەی کە زۆرترین هەولی کاریگەری بووە لەم لایەنەوە(تیپی نواندنی لاوان)بووە کە برایان(جەمال سەعید زەنگەنەو حەسەن مظفرو ئیبراهیم عەرەبو ئەدیب غەریبو ئەحمەد یاوەر)و زۆریتر ئەم بەشەیان گرتبووە ئەستۆو بەجوانی ئەیان بردبەرێوە. کاك یونس ئەڵێ لە سالی (١٩٧٠)دا ــ شانۆگەری ( کاوە وزو حاك )مان لە ئاوایی ( تۆلە فرۆش ) لەسەر چەند ئۆتۆمتیلێك کرد ، کەلە نووسینی (ئەمین میرزا کەریم) بوو، هەر چەند کارە هونەرییەکە کەمێك ساکار بوو ، بەڵام کاك یونس لەو باوەڕەدا یە کە ئەمە یەکەم شانۆگەری کوردی بێ لە خانەقین..هەروەها ئەڵێ : لەسالی (١٩٧٠ــ١٩٧١) دا ــ لەسەر شانۆی هۆڵی قوتابخانەی ناوەندی کچان ــ کە تاکە شانۆیەکە لە خانەقین ــ شانۆگەری (فندق الباشوات)مان لە دەرهێنانی جەمال سەعید زەنگەنەو بەزمانی عەرەبی پێشکەشیکرد*...

---

(*) شایانی باسە کە زوربەی شانۆگەریو کاری هونەریو زۆرکاری ئەدەبیتر لە خانەقین بەزمانی عەرەبیبووە.
کاك ئەدیب ئەڵێ : ئەم شانۆگەرییە لە سالی (١٩٧٣)شدا پێشکەش کرا.

ئەوەی ڕاستی بێ بەشی زۆری شانۆگەرییەکانی ناوچەی خانەقین ـیاخود وەکو بیستمان هەمووی ـکاك جەمال سەعید زەنگەنە دەری ئەهێناو ئامادەی ئەکرد.

کاك ئەدیب ئەڵێ: لە ساڵی (١٩٧١ـ١٩٧٢)داـ لاوان ئاهەنگێکی خۆشی لە (مەندەلی) گێڕا بەبۆنەی تێپەڕبوونی چەند مانگێك بە سەر دەرچوونی بەیاننامەی یانزەی ئادار ، لەو ئاهەنگەدا شانۆگەری ( پیری ئاخرشەڕ ) پێشکەش کرا بێجگە لە هەڵپەڕکێو گۆرانی هەروەها لەم ساڵانەدا تیپی لاوان ئاهەنگی ئەگێڕا بۆ ئەندامەکانو خەڵکی ناوشار و زۆر چیرۆکی شانۆگەری تیا پیشاندا وەکو ( بۆیاخچی)و (طبیب بالگوە )و زۆریتر..کاك ئەدیب دیسانەوە ئەڵێ کەلە ساڵی (١٩٧٢ـ١٩٧٣)دا ئاهەنگێکی گەورەمان لە هۆڵی سینەمای(خضراء)لە خانەقین گێڕاو کۆمەڵێك شانۆگەریمان لەو ئاهەنگەدا پێشکەش کرد : وەکو ( داسەکەی شاسوار )و ( طبیب بالگوە ) وسکێچی ( زفة ایام زمان ـ شایی لە کۆندا ) . هەروەها ئۆپەرێتی ( گوڵی خوێناوی)کە بۆ یەکەم جار ئافرەت چووە سەر شانۆو دەوری ینی ، کەئەویش خوشکە (ڕەمزیە عەبدو)بوو.

هەر لەو ساڵەدا لە هۆڵی ناوەندی کچان ، بۆ ماوەی هەفتەیەك ئاهەنگێکی ترمان گێڕا لە مانگیئابداو بە دوو ئاهەنگ لە ڕۆژێکدا ـ بەیانیو ئێوارەـلەم ئاهەنگەدا تیپی هونەری دەربەندی خان بەشداری کردو چیرۆکێکی شانۆگەری پیشاندا ـ کە ناوەکەی لەبیر نیەـوتیپی هونەری خانەقینیش شانۆگەری ( فلوس الدوە )و (المهرج)ی پێشکەش کرد، هەروەها لەو ئاهەنگەدا تیپی مۆسیقای سلیمانیشی بەشداری کردو ئاهەنگێکی زۆر شەنگ بوو لەزۆر لاوە هاتبوون بۆ بینینی.

کاك یونس ئەڵێ:هەر لەم ساڵەدا بەشداری ئاهەنگی یەکتر ناسینی قوتابییەکانی ( کۆلیجی ئاداب )مان کرد لە بەغدا و چەند بینراوێکی نواندنمان لەو ئاهەنگەدا پیشاندا.

ئینجا کاك ئەدیب ئەڵێ لەساڵی (١٩٧٣)داـ ، هەر لەسەر شانۆی ناوەندی کچان وەبە مناسەبەتی(٨ی شوباتەوە شانۆگەری(فندق الباشوات)مان

بەعەرەبی پێشکەش کردەوە کە لەنووسینی خۆمو دەرهێنانی جەمال زەنگەنە بوو ، هەر لەو ئاهەنگەدا شانۆگەری‌یەکی تریشمان پیشاندا بەناوی ( یاخیو ئاوارە)ەوە لەنووسینی فازیل کەریمو دەرهێنانی هەمان دەرهێنەر٠

هەر لەم ساڵەدا دێهاتەکانی (دەکەی حاجی برایم‌بەگ،و ئاوایی گەورەو سەوز بلاغو بێلوولەو مەیدان)وزۆر شوێنی ترگەڕاین،لەم شوێنانە چیرۆکی شانۆگەری(داسەکەی شـاسـوار)ی کاك(ئەمین میرزا کەریم)وهـەندێ بینراوی تری تایبەتیمان بۆ جووتیارەکان پیشان ئەدا ، لێرەدا کاك یونسیش ئەم قسانە ئەسەلمێنێ٠

هەروەها ئـەڵێ:لەهەموو چـەژنێکا لە دێی(بـاوە مەحمـوود)کۆ ئەبوونیەوەو ئاهەنگمان ئەگێڕاو شـانۆگەریمان پیشـان ئـەدا بە تایبـەتی شانۆگەری ( الحلاق الثرثار ــ سەرتاشی چەقاوەسو زۆربلێ )وهەندێ کاری هونەری تر٠

هەر لەو ساڵەدا (١٩٧٣) شانۆگەری (ام وحیدە) مان بەعەرەبی پێشکەش کرد لە سەر شانۆی هۆڵی قوتابخانەی ناوەندی کچان٠

لەساڵی (١٩٧٤)دا ــ لەسەر شانۆی هۆڵی (موستەنسریە)لە بەغدا ، لە چوار چێوەی شانۆگەریەکانی میهرەجانی هونەری کوردی‌دا شـانۆگەری (ڕێگای ئازادی)مان پیشانداو تا ڕادەیەکی بـاش سـەرکەوتوو بوویـنو شانۆگەری‌یەکەمان سەرنجی خەڵکی ڕاکێشا٠

( تیپی هونەری قوتابیان ) لە ساڵی ( ١٩٧٠ ) بەدواوە دامەزرا ، لەپێناوی پەرەپێدانی هونەری شانۆگەری‌یا یەکەم بەرهەمی لەساڵی(١٩٧١)دا ــ لە خانەقین بەناوی (پیاوی پوولپەرست) پێشکەش‌کرا دوای ئەوەشی ناو بەناو شانۆگەری پێشکەش کردوە ، لەمەدا یەکێتی مامۆستایانیش یارمەتی‌یان‌داونو بەشداری کردوون ٠٠ لەساڵی (١٩٧٤)دا ــ شانۆگەری ( التلاحم والاخوة ــ یەکگرتنو برایەتی )لەسەر شانۆی موستەنسریە لەبەغدا ، بەزمانی عەرەبی پێشکەشی‌کرد ، وەکو بۆمان ئاشکرابوو شانۆگەری ( داسەکەی شاسوار ) لەخانەقینو بەغداو هەندێ شوێنی‌تر پێشکەشی کراوە٠٠٠هەر لەو ساڵەدا دووشانۆگەری تریان پێشکەشی بەخەڵـکی شـاری خانـەقین کردووە ،

(مەزاتخانەی مێژوو)و (پیاو بەکردوەوەیە)کە لە نــووسینو دەرهێنانی کاك (هادی غولام)بوو.

هەروەها ئەم تیپە لە هەمان ساڵا چیرۆکی شانۆیی (کاکل خان)پیشاندا کە شوێنی ڕەزامەندی هەموولایەك بوو.



بینراوێك لە شانۆگەری (کاکل‌خان) ساڵی١٩٧٤
ـلەدەرەوەی‌شار ـ

بەشداران:

محەمەد فەتاح
مستەفا حوسەین
یونس ئەحمەد وەندی.

مامۆستای هونەرمەند کاك ( ناصر حەسەن )یش پێی ڕاگەیاندین کــە خۆیو هاوڕێکانی(زوهیر عەبدولجەبارو جەعفەر حەسەنو فەیزوڵا حەسەن وفازیل عەباس)و هەندێکیتر لەســاڵی ١٩٥٨ هەتــا ســاڵی ١٩٦٥ ئیشی هونەرییان کردووە وزۆر چیرۆکی بێگانەو عەرەبییان ـ بەزمانی عەرەبی

ـ پێشکەشی بە دانیشتوانی خانەقین و دەوروپشتی کردووە ، ئەم برایانــە ئەو ســاڵە ڕێی ( بزوتنەوەی هونەر ـ النشاط الفنی )یەوە ـ توانیـــان شانۆگەرییەکەی مامۆستاعانی ( ئەمرەکەی بەگم )و ( یۆلیۆس قەیسەر )ی شکسپیر لە سینەمای(نەسر ـ النصر)وسەر شانۆی هۆڵی قوتابخانەی ناوەندی کچان پێشکەشی بکەن ، هەروەها هــەمان کۆمەل شــانۆگــەری(ئوتێلو نووستن ـ فندق المنام)ی لە ساڵی ١٩٦١دا ولەدەرهێنانی کاك رەزا سەلمــان پێشکەشی کردووە ... هەروەها کاك ناصر ئــەلێ کەهەندێ شانۆگەری عەرەبیشمان پەرچڤەکرد بۆ زمانی کوردیو لەسەر شانۆ پیشانماداوە...





« دهۆك »



ڕێبازی هونەری شانۆگەری لە شـــاریدهۆکا هەتـــا بڵێی تاریکەو مەلێکی سەرگەردانو ئاوارەو وێلە ، وورشەی دەنگێکی نەبیستراو کپو وونە، ئەتوانین بڵێین هەتا ئێستا ـ لەبەر هەر هۆیەك بووبێ ـ ڕواڵەتێکی وای نەبووە کە ڕووی دیوەخانی هەبێو لافی سوار چـاکیو ئـازایەتی لە مەیدانی هونەرا لێبداو بوونی خۆی بسەلمێنێ.

تاکە کەسێك کە دووای کۆششێکی زۆر دەستمـــانکەوت بۆ ڕوون کردنەوەی ڕێبازی شـــانۆ لەشـــاری دهۆکـــدا کاك (فەرهـــاد شەریف)ی هونەرمەند بوو ، داخەکەم ئەویش لە چاوپێکـــەوتنێکی کورتبینیمـــانو توانیمان (هەندێ)شارەزایی لەم بارەیەوە لێهەلبکرێنینو بیکەینە دەسکەلای نووسینەکەمان ...

کاك فەرهاد لە پێشەوە باسی ئەوەی بۆکردین کەلە پێش ســاڵەکانی حەفتادا بزووتنەوەی هونەری شـــانۆگەری بووە ، بەڵام ساکارو کاڵو کرچ بووەو توانای هونەرمەندەکانی شارەکە لە چوار چێوەیەکی نزمو ســـاکارا ئەهاتو ئەچوو . مامۆستا ئەڵێ : یەکەم کاری هونەریم لە شـــانۆ دا لـــە میهرەجانی هونەری کوردیدا لەبەغدا دەربڕی ساڵی ١٩٧٤ ، کە ئۆپەرێتی ( بڵندی )بوو لە نووسینی کاك ( ئەحمەد تاقانە )کە تاڕادەیەکی زۆر سەرنجی خەڵـــکی ڕاکێشاو مایەی شانازیمان بوو ، ـ و لەپێشکەشی کردنی ( تیپی هونەری بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی دهۆك)بوو کە لەساڵی ١٩٧٢دا هەندێ لە برا مامۆستاکان دایان مەزراندە هەروەها لەم کاتانەشدا (تیپی هونەری قوتابخانەی مامۆستایان ) لەکارکردنا بوو و هاوبەشی ئاهەنگی قوتابخانەکانو شوێنە میرییەکانو ڕێکخراوە میللییەکانی ئەکرد لە موناسەبەتە نەتەوەییو نیشتیمانییەکاندا.

جا تیپی هونەری بەریوەبەرێتی پەروەردە لە ساڵی ( ١٩٧٥ )دا — و لە شاری بەغدا شانۆگەری (خۆر هەڵاتن—شروق)ی— لە میهرجانێکی گەورەدا پێشکەشی کردو پلەی سێیەمی وەرگرت لە سەر ڕادەی هەموو عیراق ، لە دواییشدا هەر هەمان شانۆگەری لە دهۆكدا دووبارە کرایەوەبە هەر دووشێوەی ( بادنیانیو سۆرانی ) •

هەروەها لە هەمان ساڵا تیپی لاوان شانۆگەری ( شەهید )ی لە دهۆكو کەرکووك بە کوردی — بادینانیو سۆرانی— و بەعەرەبیش بە سەرپەرشتی کاك فەرهاد پێشکەش کرد لە میهرەجانی شانۆگەری لاواندا لە نووسینی ( ئازاد عەبدوڵا ) ، ئەوشانۆگەرییە خەڵاتی یەکەمی وەرگرت لە سەر ڕادەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی ، لەسەر ڕادەی سەروی عیراقیش هەر پلەی یەکەمی وەرگرتو جێی ڕەزامەندی جەماوەری خەڵکی بووە

هەر لەو ساڵەدا لە نووسینی ( کەمال مولکی کەمال ) شانۆگەریی ( مانگرتن ) لە ڕۆژی جەژنی کرێکارانی جیهاناو بەزمانی عەرەبی لە دهۆك پیشاندرا ••• و هەر لە هەمان ساڵا — ١٩٧٥ — تیپی هونەری قوتابخانەی مامۆستایانی دهۆك ئۆپەرێتی ( ئەڤین — خۆشەویستی ) بە شێوەی بادینای لە دهۆك پێشکەش کرد •

لەسەر شانۆی هۆڵی قوتابخانەی ناوەندی کاوەو لە نووسینی ئازاد عەبدوڵاو دەرهێنانی کاك فەرهاد شانۆگەری ( بیك وزاقا ) پێشکەش‌کرا کە تاڕادەیەکی باش سەرکەوتووبوو(*) •

ئەوی ڕاستی بێ ئەم شارە تازە لە دایك بووەی لەم دواییەدا وەك ( شار )ێك چاوی هەڵهێنا ، هەتا بڵێی لەوە پێش ستو کزبوو ، زیاتر هونەری شانۆگەری ئەو تیپو کۆمەڵانەی ناسیبو کە بەڕێکەوت بۆ شەوێك یان دووان ڕێگەی وێڵیان لێ ی لائەدا کە ئەویش زیاتر بە زمانی بێگانە ئەکرا، وەك ئەو شانۆگەرییانەی لە ئاکرێو ئامێدیو دهۆكو شوێنانیتر ئەکرانو

---

(*) داخەکەم سەرەرای هەوڵ دانێکی زۆر نەمانتوای تاقە وێنەیەکی یەکێك لە بەرهەمە شانۆیییەکانی ئەم شارەمان دەست کەوێت.

لەمەو پێش ـ لەقسەکانی مامۆستا شاکر فەتاحدا ، یان لە هەندێ‌تری ئـەم باسەماندا ـ لێ‌ی دووایین •

بەڵام بۆمان ئاشکرا بوو کە ئێستا بزووتنەوەیەکی بە هێزی هونەری کوردی بەرێبازێکی ڕاستو فراوانا بەرەو ئاسۆیەکی ڕوون ملی نـــاوەو ڕۆلەکانی ئەم شارە بەدلسۆزی‌یەکی پڕ باوەڕەوە مەشـــخەڵی هونـەری کوردی‌یان هەلگرتووە بەرەو چەسپاندنی دروشمی ( هونەر بۆ گەلە ) •





## « هەڵەبجە* »



هەر کاتێك گوێم لەو گورانی‌یە ئەبێ کە ئەڵێ : « بانە سێو باری‌کرد بۆ شارەکەی هەڵەبجە » پڕ بە دڵ ئارەزووی ئەوە ئەکەم کــە ئێســتا ( ئەحمەد موختارو گۆرانو تایەر بەگو هەموو ئەو شاعیرە هەنەرمەندو بوێژە بــەرزو بلیمەتانەی تری ئەم ناوچەیەمان زیندوو بوونایە و هەریەکە سێوێكو چەپکێ تێرگزی قەدپالی شــاخەکانی کوردستانم بدایەتە دەســتیانو بــە پێلووی چاوەکانم خزمەتم بکردنایە ، بەڵــکو کەمێك ئەمەکی چاکەی ئــەو دەردو ئەندێشەیەیانم بدایەتەوە کە کێشاویانە لە ڕێی خزمەتکردنی گەلەکەما ..

خۆ وەنەبێ ئەم نەمرانە تەنیا مەبەستیان بەرز کردنەوەی ڕادەی شــیعر بووبێ ، بەڵکو دەستێکی بالآیان هەبووە لە پێش‌خستنو چەسپاندنی بناغەی شانۆی کوردەواری، لەم ناوچەیە ، وەکو کاك ئەژی گۆران ئەڵێ کە لە پێش بیستەکانا ( سلێمان بەگی کاتب فارسی ــ باوکی گۆران ) لــــە هەڵەبجەو دێهاتەکانی دەوروپشتی بینراوی تەمسیلی ڕێك‌ئەخستو لە ( شــــەوارە )و مناسبەتەکانی تری ئەو سەردەمەدا پیشانی خەڵکی ئـــەدا ، وەکو بینراوی ( تازیو دادگا )و ( پاشا پاشا )و شوانو بەرغەڵو گورك )و زۆر شـــتی تریوا ...

هەروەها مامۆستا ع. ع. شەونم ئەڵێ کە لە زەمانی ئەحمەد موختاراو لە سالەکانی دوا دوایی بیستو سەرەتای ساڵەکانی سی‌دا ســەیرانی گەورە

---

(*) سەرچاوەکانم بۆ ئەم بەشە،مامۆستایان:
١ ــ ئەژی گۆران.
٢ ــ رەووف یەحیا.
٤ ــ ساجد ئاوارە.
.. بوون.

گەورە ئەکراو هەمو خەڵکی شار تیا بەشدار ئەبوونو بۆ ماوەی هەفتەیەك دووکانو بازاڕ دائەخراو گەورەو بچووکی شار ڕەویان ئەکردە ناوچـــەی ( زەڵم ) یان ( خورماڵ ) ، لەوێ دوای ئەوەی پارە کۆ ئەکرایەوەو (چێشتو گۆشت )ێکی زۆر لێ ئەنرا ، و ( میری ) دائەمەزراو بەو دەســتورەی کــە لەسلێمانی‌یا باو بووە خەڵکی تاوان بارو زۆردار تەمێ ئەکراو زۆر جاریش پارەیان لێ ئەسەندرا ، یان ئەخرانە ناو ئاوەوە ، یان بە هەر شـێوەیەکی تـر بوایە سزایان ئەدراو ماف ئەدرایەوە بە خاوەنی ، لەم سەیرانانەدا ( مـــەلا عەبدوڵای بەقاڵ ) ئەکرا بە پاشاو ، ئەمیش فەرمانی شاهانەی دەر ئەکردو ، خێوەتی تایبەتی بۆ هەڵئەدرا و وەزیرو دەستو پێوەندی بۆ دیاری ئەکرا ،و لەگەڵ یاری‌و گەمەی ئەو سەردەمەدا هەندێ بینراوی ساکاری وایان پیشان ئەدا کە بۆنی ( نواندن )ی لێ ئەهات ...

مامۆستا شەونم ئەڵێ: یەکەم شانۆگەری لە هەڵەبجەدا لەساڵی (١٩٣٩)دا پێشکەش کرا لە لایەن قوتابیانی قوتابخانەی هەڵەبجەی سەرەتایی کوڕانەوە کە چیرۆکە شـــانۆگەری‌یەکەی مامۆســـتا هەوری بوو ( دڵداری‌و پەیمـان پەروەری ) لەهەمان ساڵاو هەر ئەو کۆمەڵە کاتێك بەنـــاوی دیدەوانی‌یەوە چوونە سلێمانی لەوێ ئەو شانۆگەری‌یەیان دووبارە کردەوە ..

دوای ئەو زۆر چیرۆکی شانۆگەری‌تر پیشان دراوە لــە چوار چێوەی بزووتنەوەی هونەری لە قوتابخانەکاندا .. وادەر ئەکەوێ کارێکی ســاکارو کاتی بووبن ..

هەروەها لەم سەردەمانەدا هەندێ تیپی هونەری‌تر لە قوتابیانو لاوان لە سلێمانی‌یەوە سەریان لە هەڵەبجە داوەو ئاهەنگو تەمسیلیان پیشانداوە، وەکو مامۆستا شەونم ئەڵێ : لە ساڵی (١٩٤٧)دا تیپێکی هونەری هاتن بۆ هەڵەبجە کە مامۆستایان ئەحمەد هەردی‌و شەماڵ سائیب‌و مەجید ڕەشیدو زۆری تر تیا بەشدار بوون ، و لەمـــاڵی (کەریم بەگی داود بەگ)کە قوتابخانە بوو ــ و ئێستا ئینحیسارەـ ئاهەنگێکی شەنگیان پێك هێناو مامۆستا ئەحمەد هەردی لەو ئاهەنگەدا گۆرانی ئەووت .

ئینجا دوای ئەمانە ناو بەناو بینراوی بچووك لە بەرهەمی قوتابیـــان

پێشکەش ئەکرا هەتا ساڵی (١٩٥٦) کە توانراچیرۆکی شانۆگەری ( بازرگانی ڤینیسیا)ی ـ شکسپیر ئامادە بکەن ، مامۆستا شەونم ئەڵێ : لە هەڵەبجەدا هیچ هۆڵو شانۆ نەبوو ، لەبەر ئەوە هاتیی ئەم شانۆگەری یەمان بۆ قوتابیـــانی قوتابخانەی هەڵەبجەی دووەمی سەرەتایی کوران ساز کرد ، پێشەکی بەقەرز شانۆیەکمان لە قوتابخانەی ناوەندی هەڵەبجە دروست کرد بەو هیوایەی کە دوای پیشاندانی شانۆگەری یەکە قەرزەکە بدەینەوە٠٠٠سا هەرواش بوو، کاتێك بۆ مـاوەی هەفتەیەك پیشانمان داو هەر بلیتێکمان ئەفرۆشت بـە (٢٥٠)فلس توانیمان قەرزەکە بدەینەوەو هەندێ کەلو پەلی تریش بۆ شانۆکە بکڕین کە هەتا ئێستاش ئەو شانۆیە ماوە ٠

ئینجا لە ساڵی (١٩٥٧)دا ـ شانۆگەری یە نەمرەکەی خانی (مەمو زین)مان ئامادە کردو پیشانماندا کە مامۆستا ( ئەحمەد ڕەشید عەبدوڵا ) بەشـداری تیاکردو تا رادەیەکی باش سەرنجی خەڵکی ڕاکێشا ٠٠

هەروەها کاك (جەمال مەلا قادر) لە (١٩٦٠)دا ـ تیپێکی شانۆیی دامەزراند و زۆر لاوی خوێن گەرم لە بەرهەمەکانیا بەشدار بوون ٠

لیژەوە جەمسەری بیرەوەری مامۆستا ( سـاجد ئاوارە ) ئەکەوێتـــە دەستمان کە بەڕێبازی ئەم هونەرەدا ئەمانگێڕێتەوە بۆ ســـاڵەکانی چلو بەرهەمە شانۆگەری یەکانمان لەم شارەدا بۆ ئاشکرا ئەکاو ئەڵێ :

لەو ساڵانەدا ، بەتایبەتی ساڵی (١٩٤٤ـ١٩٤٥) لە بیرمە کـە کابرایـەك هەبوو لە هەڵەبجەدا ناوی ( عوسمان عەبابەیلێ‌یی ) بوو ، ئەمعوسمانە لـە هەموو سەیرانو ئاهەنگێکا ئەهات ( وەکو قەرەقۆز ) دەســـتەکانی ئەکرد بەسەری مرۆڤو ئەیجوولاندنەوەو خۆیشی قسەی ئەکردو وەڵامی خۆیشی ئەدایەوەو لاسایی هەموو دەنگەکانی ئەو کەســـانەی ئەکردەوەو جۆرە (نواندن)ێکی پیشان ئەدا٠٠لەساڵی (١٩٤٥ـ١٩٤٦)دا ـ ئاهەنگێکی گەورە بۆ جەژنی ( نەورۆز ) سازکراو شانۆگەری ( کاوەو زوحاك ) لەو ئاهەنگەدا لە لایەن ( مامۆستا محمد حەویز ـ حەمە ڕەش ـ و ئەحمەد گۆچانو قالەی ئەحمەدی شیرینو ئەحمەد جووتیار ـ ئەحمەد غولام ـ )ەوە پێشکەش کرا ٠

هەروەها لە ساڵی (١٩٥١ـ١٩٥٢)دا ـ مامۆستایەك هەبوو ناوی (کەمال

ریمــاوی ) بوو ، مامۆستای قوتابخانەی ناوەندی هەڵەبجە بوو ، لە بنەڕەتا ئەلەستینی بوو ، چیرۆکێکی شانۆیی بەشیعر نووسیبەوە لەژێر ناوی (پیاوی چرووك)دا ، کە لە ڕواڵەتا زۆر لەشــانۆگەری ( پیسکەی تەرپیر )ی مۆلێیر ئەچوو ، لەو ساڵەدا قوتابیانی ئەو قوتابخانەیە ( ڕەووف حەمە ئەمینو ئەحمەد محەمەد ڕەشید ئەحمەد جووتیارو کەریم شێخ محمد ئەمین )و زۆری تـــر ئامادەیان کرد بۆ سەر شانۆو پیشانیاندا ، خۆم ــ ئاوارە ــ لە و ئاهەنگەدا شیعرێکی ( ڕەصافی )م خوێندەوە ... لێرەدا کاك ( عەلی لەواش )م بـــیر ئەکەوێتەوە کەلە سەیرانەکانا ڕووالەتی خۆی دەگۆڕیو تەمسیلی دەکرد ، هەروەها لە ساڵەکانی پەنجادا ( ئەسعەدی کەبابچی ) ئەویش لە سەیرانەکانا تەمسیلی ( پیاوی شەڕانی ) ئەکرد .

لەساڵی(١٩٥٥)بەدواوە مامۆستا عەلی شەونم،تیپێکی تەمسیلی پێك هێناو زۆر شانۆگەری خۆماڵیو بێگانە ــ بەتایبەتی شـــانۆیەکانی شکسپیرـــی پێشکەش کرد، مامۆستا (ڕەئوف یەحیا)ش ، هەر لەو ساڵانەدا هونەرمەندێتی خۆی بۆ خەڵکیئەو ناوچەیە سەلماندو بەشداری زۆر چیرۆکی شـــانۆگەری کرد ــ کە لەدواییدا باسیان ئەکەین ــ .

ئینجا لەساڵی (١٩٥٨ــ١٩٥٩)دا ــ شانۆگەری ( ئەنجامی زۆر داری)م نووسی ــ مامۆستائاوارە ئەڵێ ــ هەرلەو ساڵەداو بۆ ماوەی (دە)ڕۆژ لەسەر شانۆی قوتابخانەی ناوەندی هەڵەبجە پێشکەشمان کرد لە گەڵ چیرۆکێکی شانۆیی بچووکی کۆمێدیتردا ، و ئەکتەرەکانی برێتی بوون لە قوتابیـــــان ( نووری شێخ فەرەجو ڕەوفی ئەخلو جەمال حسین عەزیزو هۆگر مەحموود) زۆر قوتابیتر ...

مامۆستا ساجد ئەڵێ : هەر لەو ساڵەدا ــ دوای شـــــۆڕشی چواردەی تەمموز ــ چیرۆکی شانۆگەری ( ساڵی دوودرۆ )م نووسیو خۆم بەشداری نواندنەکەیم کرد..هەروەها لەساڵی(١٩٦٢)داــ تەمسیلی(نەورۆز)مــ ئامادە کرد بۆ قوتابیەکانی قوتابخانەی ناوەندی هەڵەبجەو لە گۆڕەپانی جۆی تەیارە پێشکەش کرا ، سەرەڕای کزبوونی چرای شانۆی کوردی لەشـــەستەکانا ،

سالی (١٩٦٣) شانۆگەری‌یەکی ترم نووسی بەناوی ( نەترس )ەوە ، لەتەوێلە لەلایەن هەندێ لەقوتابیانەوە پیشاندرا کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی شانۆی شارەکەدا (کچێك) بەشداری نواندنی کرد لەسەر شانۆ ..



**بەشدارانی شانۆگەری ( ئەنجامی زۆرداری )**
**ڕۆژی ١٩٥٨/٧/٢٦**
**لە هەڵەبجە**

کاك ( ڕەوف یەحیا )ش لەم بارەیەوە ئەڵێ :

لەگەڵ دامەزراندنی ( کۆمەڵی هونەرە جوانەکان )لە سلێمانی چیرۆکی شانۆگەری (لەڕێی نیشتیماندا)مان هێناو دووبارە ئامادەمان کردەوە بۆسەر شانۆ بەبەرگێکی نوێ‌و دەرهێنانێکی تازەوە ، هەر لەوساڵەدا لە هەڵەبجە پێشکەشمان کرد ، لەهەمان ساڵا شانۆگەری ( کچ فرۆش )م دەرهێنـــاو لەهۆڵی ناوەندی هەڵەبجە پێشکەشمان کرد کە لەنـــووسینی کاك ئەمینی میرزاکەریم بوو ... هەروەها بۆ ساڵی دوایی(١٩٥٧)هەمـــوو ئەندامانی کۆمەڵی هونەرە جوانەکان چوون بۆ ســـەیرانی ئەحمەد ئاوا و لەوێشـــەوە لامان دایە هەڵەبجەو شانۆگەری (پیسکەی تەڕپیر)مـــان بۆ ماوەی شەوێك

پیشان‌دا٠٠ئینجا له سالی (١٩٦٠)دا ــدوو چیرۆکی شانۆگەریم بۆ کۆمەڵێك له گەنجەکانی شاری هەڵەبجە ئامادەکرد ، یەکەمیان (ئەمرەکەی بەگە ) لــە نووسینی مامۆستا یوسف الغانیو دووەمیان (لەسوور ئەترسم)بوو، وهەر لەو ساڵەدا له هۆڵی ناوەندی هەڵەبجە پیشان دران٠

بەڕاســتی قوتابیەکانی ئــەم قوتابخانەیه دەمێك بوو له کۆڕی نواندنا ئاوازیان دەنگی ئــەدایەوەو بــه جۆشــێکی بێ‌ســنوورەوە لەو کۆرەدا هەڵئەسوڕان، ئەوەبوو له ساڵی(١٩٦٥)داــ شانۆگەری (بێ ئیشی)یان هەر له هۆڵی قوتابخانەکەدا پیشان‌داو تارادەیەکی زۆر سەرنجی خەڵکیان راکێشا بۆ لێ‌هاتوویی وتوانای هونەری‌یان ٠٠٠ دوای ئەوە لــه ســاڵی (١٩٦٦)دا ئەندامانی (بزووتنەوەی هونەری)له هەڵەبجە شانۆگەری(ئەمرەکەی بەگم)یان هێنایەوە بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك پیشانی خەڵکیان دایەوە٠

لەساڵی (١٩٧٠)دا (کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی ) له سلێمانیەوە چونە هەڵەبجەو شانۆگەری ( ئۆتۆمبیلچی )یان پیشکەش کرد ٠
هەروەها له ساڵی(١٩٧٣)داــ تیپێك له قوتابیانی هەڵەبجەو بەسەر پەرشتی (بزووتنەوەی هونەری‌کاك عوسمان چیوار شانوگەری‌یەکەی ئەمینی میرزا کەریم(داسەکەی شاسوار)ی بۆ ئامادەکردن‌و پێشکەشیان کرد٠

ئەگەر بێتو سەرنج بدەینە باری شانۆ له شاری هەڵەبجەدا وله ڕێبازی ئەم هونەرە وورد بینەوە بۆمان ئاشکرا ئــەبێ که خەڵکی ئەم شــارە لــە هونــەرمەندو بوێژو ڕۆشــنبیر کەمی‌نیەو له زووەو ئــارەزووی خۆیان بە هۆی هونەرەوە دەربڕیوەو لێ‌هاتوویی خۆیان سەلماندووە ٠٠ بەڵام داخەکەم ڕۆژگاری چەپخوون‌و نالەبار ماوەی توانای هونەرمەندانی شــانۆی ئــەم شارە حەپەساوەی نەداوە کەنەشونمابکاو ڕێ‌ڕەو خۆش بکات ، بەتایبەتی له شەستەکان بەدوواوە ئەگینــا (هەلەبجــە)گانگای جوانــی‌و ڕازاوەیی سروشت‌و دەریــای هونــەرێکی پــاك وپێشڕەوو سەرچــاوەی ئیلهــامی چەندەهای وەکو گۆران‌و مەولەوی‌و زۆری‌تر بووە له پێناوی سەربەستیا چەکەرەی کردووە٠٠٠



## « هونەری نواندن لە ئیستگەی کوردیدا»*



ئیستگەی رادیۆی بەغا ــ بەشی کوردی ــ ئەگەرچی لە چلەکانا بەتەواوی دەستی کرد بە ئیش‌کردن‌و بلاوکردنەوەی پرۆگرامەکانی ، بەلام بێگومان لەو رۆژەدا دەستێکی بالای بووە لە کۆکردنەوەی هونەرمەندان‌و رۆشنبیران لە دەوری‌خۆی‌و سوود وەرگرتن لێیان کاك ئەحمەد دەنگ‌گەورە ئەلی : لەسالی (١٩٤٧)دا ــ کە ڕێم کەوتە ئیستگە ڕوانیم تیپێکی نواندن لە کارکردنایە کە ئەندامەکانی برایان (حسین جەلال‌و صالح یەحیا) وهەندێکی‌تر بوون کە ئەوسا قوتابی بوون لە قوتابخانەی مامۆستایان لە بەغدا، لەژێر چاودێری رەفیق چالاك چیرۆکی نواندیان تۆمار ئەکرد بۆ ئیستکە ...

ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە ئیستگە هەر لە دوای دەست‌کردنی بەبلاو کردنەوەی پرۆگرامەکانی تیریشی لە دامەزراندنی تیپێکی نواندن کردۆتەوەو بۆ ئەم مەبەستە خۆی ئامادە کردووە.

ئینجا مامۆستا دەنگ گەورە ئەلێ : دوای ئەوان من‌و خوا لێ‌خۆشبوان رەفیق چالاك وئەحمەد دلاوەر ، هەروەها برایان نوری‌عەمبەر وفایەق چالاك تیپێکی نواندنمان پێکەوە نا، لەماوەی سێ سالا زیاتر لە(١٢٠) تەمسیلی ئیستگەییمان تۆمار کرد لە چیرۆکی خۆمالی وبێگانە، ئەو تەمسیلانەی لەناو

---

(*) برایان .. کاك :
١ ــ عەبدولرەحمان حەکیم
٢ ــ بەختیار سیامەنسوری
٣ ــ حەمە فەرەج مەعرووف
٤ ــ ئەحمەد دەنگ‌گورە
یارمەتی‌یەکی باشیان دام لەنووسینەوەی ئەم بەشدا کە هەمیشە شایانی رێزو ساناریمن...

خەلکا ناوبانگی دەرکرد بوو (بووکو خەسوو) (مایکـروفۆنی ئیستگەی کوردی)و گلکۆی تازەی لەیل)و (بـەزۆر کردیـان بە دوکتۆر)و(بـاجی ئایشێی مامان) گەلێ چیرۆکیتر بوون. بەناوی (تیپی کۆمـەلێ ئـاوازی کوردی)شەوە ، لە دوای ناوەراستی پەنجاکانا نزیکەی (٦٠) چیرۆکی ترمان لە ئیستگە تۆمار کرد کە ئەندامەکانی بریتی بوون لە خـۆم(دەنگ گـەورە)و فەتاح کاوە وتەها بابانو محمد نوری عارفـو دلشاد مەسرەفو دوو خوشك بەناوی ( قومریەو پەروین )ەوە ، بەناوبانگترینی ئەو چیرۆکانەمان (خنکاوی دەریا)بوو.

کاك عەبدولرەحمان حەکیمیش لەم بـارەیەوە ئەلێ:لە بیرمە کەیەکەم چیرۆکی کوردی ئێستـگەیی‌بەشێوەی بادینانی لە سالی (١٩٦٢)دا تۆمار کرا کەکاك حافظ مائی ئامادەیکرد بووو کاك جەلال ئـەتروشیو گـولبەهارو گولیزار بەشداریان تیاکرد ... بەلام لێرەدا کاك حـەمە فەرەج ئەلێ کە یەکەم تەمسیلی ئیستـگەیی بەشێوەی بادینانی چیرۆکێك بوو ــ کەناوەکەی لەبیر نیە ــ لە ئامادەکردنی کاك محمـد ئەمین عوسـمانو لەسالی (١٩٦٠)دا تۆمـارکراوکاك جەلال ئەتـروشیو محمد ئەمین عوسمـانو دوو کچیتر هاوبەشیان تیاکرد..

هەروەها کاك حەمە فەرەج ئەلێ کە لە سالی (١٩٦٨)دا ــ کۆمەلێك لە قوتابیـانی ئـامۆژگەی هونـەرە جوانـەکان لە بەغدا چـیرۆکی(کاروانی پیرەمێرد )یان تۆمار کرد کە لە شیعری ( پیرەمێرد )بوو ، هەر ئەو کۆمـەلە نزیکەی (١٥) چیرۆکی تری بۆ ئیستـگە تۆمارکرد کە بریتی بوون لـە برایان (حەمە فەرەجو سمکۆ عەزیز وئەلبیرت کیغام وبورهان کەریمو حەمدیە محمد ئەمینو رەمزی قەزازو قوتابییە کوردەکانی تری کۆلیجەکانی بەغدا بوون ) ناوی ( تیپی دوانزە سوارەی مەریوان )بوو ، هەرئەو تیپەش بوو کـە لـە دواییداو پاش ئەوە گۆران بە سەر ئەندامەکانیا هات بوو بە(تیپی تەمسیلی ئیستـگەی کوردی)ونزیکەی زیاتر(١٠٠) تەمسیلی تۆمار کرد...

لێرەدا کاك دەنگ گەورە ئەلێ، لە مانگی ئەیلوولی(١٩٥٧)دا تیپی تەمسیلی ئیستـگە وبەهاوکاری کۆمەلی ئاوازی کوردی لە بەغدا چووین سلێمـانیو

هەڵەبجە ، سەرەڕای گۆرانیو هەڵپەڕکێ وزۆرکاری هونــەریتر چیرۆکی شانۆگەری (باش‌کاتب)یشسان لە نووسینی کاك کامل‌ژیر پێشکەش کرد . بەلاّم لێرەدا مامۆستا ژیر ئەڵێ ، لە هەڵەبجە چیرۆکی شانۆگەری ( ســەری گلۆلەکە )ی مامۆستا عانیمان پێشکەش کرد ...

لەم گەشــتەدا خەڵــکی سلێمانی ماوەی هەفتەیەك ڕایان بوارد لەگەڵ هونەرمەندان (رەسوڵ گەردیو رەزاعەلیو حەسەن جــەزراوی وئەحمەد دەنگ‌گەورەو کچەبچکۆلە(دەلاڵ)و شەماڵ سائیبو عومەر مەجیــد بابانو کامیل ژیــر وکۆرسی ئیستگەو مۆســیقا ژەنەکان ، لەهەڵەبجــەش دوو ڕۆژمانەوە،بەهۆی ناوبردی کۆمەڵی ئاوازی کوردیەوە ئەڵێین کە ئەم کۆمەڵە لەکاتی موناسەباتەکانا ئاهەنگەکانی ئەبرد بەڕێوەو سەرپەرشتی ئەکرد ...

لێرەدا کاك حەمە فەرەج ئەڵێ : لە ساڵی (١٩٦٠)داــ پانتۆمیمێکم ئامادە کرد وبەناوی (تیپی ئیستــگەی کوردی)یــەوە لەگەڵ کاك حسین قــەرەداخی لە تەلەفیزیون پێشکەشسان کرد ، کەئەوسا تۆمار نەئەکرا ، بەڵکو بەرهــەمە هونەریەکان یەکســەر ئەدران بەهەوا چونکە هێشتا ئامێری تومار کردنیــان نەبوو. لەهەمان ساڵا چیرۆکی(گوڵی خوێناوی)م ئامــادە کردو بەشیعر لە گەڵ کچەکەی خوالیخۆشبو رەمزی قەزاز لە تەلەفیزیۆنەوە پێشکەشمان کرد کە نزیکەی (٣٠)کەسی ترتیایا بەشداربووە.

لێرەدا مامۆستا(بەختیــار سیامــەنسووری)و نــامە شیرینــەکەی کە ــبەسوپاسەوەــبۆی ناردین پێشکەشی ئەکەین کە ئەڵێ:ئێستا خــەریکی ئامادەکردنو دەرهێنانی چیرۆکێکی زنجیرەییم بۆ ئیستگە کە برێتیە لە(٣٠) ئەڵقەو هیوادارم کە جێیرەزامەندی جەماوەری کوردمان بێت.

دوای ئەوە ئەڵێ : یەکــەم چیرۆکی تەمسیلی کوردی کە لە ئیستگە تومارکراوە (باوەژن) بووە لە نووسینی خوالیخۆشبو(ئەحمــەد دلاوەر)و دەرهێنانی مامۆستا (عەبدولاّ عەزاوی)...

ژمارەی ئەوچیرۆکە تەمسیلیانەی کە تا ئێستــا لە ئیستگەی کوردی تۆمار کراون (٣٢٦) تەمسیلە لە چیرۆکەکانی خۆماڵی وبێگانەو منداڵان ، بەم

بۆنەیەوە مامۆستا ئەڵێ :ئێستا هەوڵی ئەوە ئەدەین منداڵان خۆیان چیرۆکەکە تەمسیل بکەن بۆ خۆیان، ئێستا زۆر چیرۆکمان بۆ تۆمار کردوون ، وەکـــو (هێرشی ئازا) (یارمەتی‌یەك بدەن) (شێرکۆی قارەمان)و هەندێکی‌تر.



ـ تیپی ئیستگەی کوردی ـ
لەسەر شانۆی قوتابخانەی ناوەندی سلێمانی ڕۆژی٩/٩/١٩٥٧
لە کاتی گۆرانی ووتنی کاك (ئەحمەد دەنگ گەورە)دا

لە دواییدا کاك سیامەنسووری ئەڵێ : تا ئێستـــا زۆر دەرهێنـــەری سەرکەوتوو لە ئیستگە ئیشیان‌کردووە وەکو (عەبـــدوڵاعەزاوی‌و ئەحمەد سالارو بەختیار سیامەنسووری‌و فەرهـــاد شـــەریف‌و هاشم عەلی مەندی وناسر حەسەن)وزۆری تر.

دوا بەرهەمی بەشی تەمسیلی برێتی‌یە لە دو چیروکی زنجیرەیی کەهەر یەکەی پێك هاتووە لە (٣٠)بەش:

١ ـ (پاڵەوانەکانی موسوڵمانان)لە نووسینی ئیبراهیم سەلمانو دەرهێنانی ئەحمەد محمد عەلی‌یە •
٢ ـ (شیماء) لە نووسینی محمد جیهاد حەسەنو دەرهێنانی کاك بەختیار سیامەنسووری‌یە •

هەتا ئێستا ئیستگەی کوردی بەردەوامە لە پێشکەش‌کردنی چیرۆکی تەمسیلی‌و بەرهەمی هەمەرەنگی‌تر •

وەهەر چی چۆنێ بێ ئێمە بێ‌گومانین لەوەدا کە ئیستگە شوێنی کاری هونەری‌یەو بەرهەمی هونەرمەندەکانمان تیایدا چاو هەڵئەهێنێ ، لەبەر ئەوە بەرای ئێمە ئەگەر بێتو کارگێڕانی ئیستگە زیاتر هیممەت بکەنو زیاتر ڕێگە خۆش‌بکەن بۆ هونەرمەندانو ئەدیبانو میری نیشتیمانیش کۆمەکی بکاتو زیاتر یارمەتی بداتو ئیستگەکە لەڕووی هونەری وتەکنیکی‌یەوە بەهێزتر بکەن ، ئەوسا خەڵکیش میلی رادیۆکانیان بەرەو ڕووی ئەبەنو کەڵکی لێ‌وەرئەگرنو باشتر هاوکاری لەگەڵ ئەکەن ••



لەبەرڕۆشنایی بەشی دووەمی باسەکەمان ، باسەبرێکی باری ئێستای شانوی کوردەواریمان بکەین لە چوار چێوەیەکی هونەری ووێژەییــدا، بۆ ئەوەی بتوانین لەبەر ئەو رۆشناییە باشترین ڕێگە بگرینەبەر و پەرەپێــدانو پێش خستنی شانۆمان بخەینە ئەستۆ تاوەك چەکێکی ڕۆشــنبیری کاریگەر لە پێناوی دواروژێکی باشترو ئاسودەتر بۆ گەل بەکاری بێنینو هونــەری گەلەکەمان بە گەلانی جیهانو بن‌بڕ کردی کانیــاوی دوو دڵیو دواکەوتنو بەرهەڵستەکانی‌تری ناو کۆمەڵمان٠٠

بێگومان شانۆی کوردیمان لە ساڵەکانی دوای (حەفتا)وە، توانی بوونی خۆی بسەلمێنێو بەشێوەیەکی شیــاو وەك هونەرێکی سەربەخۆ دەرکەوتو لاوەکانمان شارەزایی‌یەکی باشیان لەهەموو بەشە زانیاری‌یەکانیا پەیدا کردو یاساو ڕەوشتی قوتابخانەکانی شانۆ فیر بوونو بەکردەوە سەلماندیــان کە ئەمەش هیچمــان لە توانای هونەری گەلانی‌تر کەمتر نیــە ئەگــەر چەرخی چەپ‌گەرو کەمێك قینو ڕقی کەم بکاتەوە وترووسکەیەك لە ئاسۆی هیوایەوە دەربکەوێ٠

ئەوە بوو لە ساڵی‌حەفتا بەدواوە چەند هەنگاوێکی زور باش‌نراو توانرا لە مەیانی هەموو هونەرێکا ئەســپی توانای هونەرمەندەکانمــان تاو بدرێو هونەرمان بەزۆرلای‌عیراقو بەڵــکو جیهانیش نامــرا، هونەرەکانمان چەند پلەیەکی باشی بەرەو دوا روژی هونەرێکی رەسەنی کوردی٠برِی٠

لێرەدا ئێمە نامانەوێ بلێین کە ئیتر باپشتێنی ماندو بوونو گەیشتن بە ئامانجی لێ‌بکەینەوەو بۆ خۆمان شــانی بێ پەروای لێ دادەین ، بەڵکو

ئەڵێین ئیمڕۆ لە هەموو ڕۆژێکیتر زیاتر پێویستمان بــە تێکۆشـــانێکی بێ ووچان هەیە لە پێناوی هێنانەدی ژیانێکی خۆش گوزرانی بۆ نیشتیمان ودروشمی (هونەر بۆ گەل)بچە سپێنین٠٠

شانۆمان ـــ وەك هەموو شـــانۆیەکیتری هاو چەرخ‍ـخاوەنی گیرو گرفتو کەمو کووڕی خۆیەتی ، ئێمە لێرەدا هەندێکی ئەخەینە بەرچـــاوو لابردنو چارەکردنیشی شانی ئەوانە ئەگرێ کەئەیان گرتەوە٠٠٠

١ ـــ نەبوونی نووسـەری شانۆیی‌ـ یان بابڵێین نەبوونی شانۆگەری کوردی‌ـ کە ئەتوانم بڵێم ئەمە گەورەترین کۆسپە لە ڕێبازی شانۆی میللەتەکەمانا، شانۆی کوردی پێویستیەکی زۆری بە نووســەری واهــەیە کــە لە ناوجەرگەی میللەتەوە بنووسێتو شاردزایی هەبێت لە زانستیــەکانی شانۆداو باری ئێستای شانۆشی لە بەرچاوبێ٠

من لێرەدا سلاوی ڕێزو دڵسۆزەم پیشکەشی بەو براو ماموستـــایانە ئەکەم کە بۆ شانۆیـــان نووسیوە ، وەکو (ئەمین میرزا کەریمو عبدالرزاق بیمارو سمکۆ ناکام ومحمد سەدیق مەحموودو حەمە کەریم هەورامیو ئەحمەد سالارو کامیل ژیرو ٠٠٠زۆریتر)،هەروەها وەرگێڕەکان،بەتایبەتی (ڕەووف حەسەن )کە توانیویەتی لە کاتی گۆڕینی چیرۆکەکانا مۆرکێکی تایبــــەتی کوردی لێبداو تامو چێژێکی تایبەتی پێ‌ببەخشێ٠٠٠!!

ئەمانەو زۆری تریش هەوڵێکی باشـــیانداوە کە بەڕێگەیەکی زانستی باسی ڕووەکەی تری ژیانی مرۆڤی کورد بکەن ودیوی نـــاوەوەی ژیـــانی شیتاڵ بکەنەوەو ئەنجامێکی ڕۆشن بۆ تەنگو چەڵەمەکانی ڕۆژانەی دابنێن، بەڵام لێرەدا خۆزگە بۆ ئەوە ئەخوازم کە نووسەرە بەرێزەکانمان ئاوڕێك لە کتێبخانەی کوردی بدەنەوەو زیاتر هەوڵ بدەن بۆ پێش خستنی ئەم هونەرە بەنرخەی کە باری ئیستای ووڵاتمان بە ملکەچیەوە چاوەڕێیەتیو کەم کوڕی کتێبخانەکانمان لە ئەستۆی ئەوانە٠٠٠

٢ ـــ نەبوونی ئافرەت٠٠لە هەموولایەك ئاشکرایە کە شانۆ ئاوێنـــەی ژیانی خەڵکیەو لە چوار چێوەیەکی هونەری یا باری ژیانی کۆمەڵ شیتاڵ ئەکاتەوە باشترین ڕێگە دائەنێ بۆ چارەسەرکردنی گیرو گرفتـــەکانی ، کە

ئافرەت بەشێكی گرنگی دروست ئەكەنو بێسڵەمینەوە ئەتوانین بڵێین كە بەڕاستی نیوەی كۆمەڵن ، و ئەركی گرنگی سەر شانیان لە هاوكاری كردنی بەڕێوبردنی كۆمەڵا تووشی گێـژاوی گۆمی شڵەقـاوی ژیانیـان ئـەكاو پێویستیان بە هاوارێكی توندە بۆ گەیشتنیان بە ئامانجیانو ڕزگاركردنیان لە كۆتو زنجیری دروستكراو یان... شـانۆش باشترینو كاریگەرترین ڕێگەیە بۆ گەیاندنی هاواریان بە هەموو كۆمەڵ،بەتایبەتی ئافرەتی ئێمـە كە بێبەشە لە هەموو مافێكی ڕەوای خۆی لە گشت كەسێك زیاتر پێویستی بەوە هەیە شان بەشانی براكانی لە كاركردنا قاڵ ببێو بەڕاستی ڕووی كۆمەڵ لەسەر شانۆ پیشان بدەنو دەنگی هەست وبیریان بە هەموولایەك بگەیەنن . لێرەدا ڕێزو سوپاس پێشكەش بەو خوشـكە بەجەرگانە ئەكەین كە پۆتی نالەباری بەسـتنەوەو ژێر دەستی یـان پچرانـدو وهاوبەشی هەنـدێ شانۆگەرییان كردووە ... بەڵام ئەڵێین كە شـانومان بێ ئافرەتی پێوە دیارەو ئافرەتی ئێمەش هیچیان لە خەڵـكی كەمتر نیە ..



**پاڵەوانی سەر شانۆی كوردەواریمان لە ساڵەكانی پەنجادا خوشكە**

**( نەرمین سەعیـد ناكام )**

٣ ـ نەبوونی شانۆیەکی ڕێـکو پێك بەهـەموو پیویستی‌یـەکانی هونەری‌یەوە لە سلێمانی‌و زۆربەی شارەکانی‌تری کوردستانی عیراقا کارێکی گرنگی کردۆتە سەر باری هونەری شانۆیی وزۆر جار تیپەکان لە تەنگ‌و چەڵەمەی بێ‌شانۆیی ـ سەرەڕای هەموو گیرو گرفتێکی‌تر ـ ئەسلەمێنەوە، وەکو بیسـتمان هەندێ پـارە تەرخان کراوە بۆ ئاوەدان کردنەوەی شانۆ پەڕپووتەکەی قوتابخانەی ئامادەیی کوڕان لە سلێمانی کە هیواداریِن ئەمـە ڕاست بێ ، هەروەها شانۆ بچکۆلەکەی(چالاکی قوتابخانەکانی سلیمانی) کەم‌و کوورِییەکی زۆری هەیەو لە هەموو کارێکی هونەریدا ئەرك وئازارێکی زۆری تیپەکانمان ئەدا تا ئەڕازێتەوەو ئامادە ئەکرێ تا ووردە ئاهەنگێ یـا شانۆگەرییەکی خۆماڵی لەسەر پیشان ئەدرێ..

ئەگینا خوا نەکا بتوانین مرح لەوە خۆش بکەین کە پەلە قاژەیەك بۆ لایەنەکانی تری هونەری شـانۆیی بکـەین ، وەك ئۆپەرێت‌و شـانۆی منداڵ‌وبالێ‌و شانۆی بووکە شووشە ـ مسرح العرائس ـ و شانۆی شیعری‌و زۆر کاری هونەری‌تر کە پێویستی‌و کەرەسەی تـایبەتی‌یان ئەوێ وهەتا ئێستا شانۆ بێ توانا کانی ئێمە لێی بێ‌بەشەو چاوەڕێی دەسـتی ڕەنگینی پڕ توانای هونەرمەندەکانمانە..

٤ ـ ئەو گیروگرفت وئەندێشەیەی تووشی هونەرمەنـدانمان ئەبێ لەکاتی پێشـکەش کردنی شانۆگەرییەکدا لە سەرشانۆ، یان لەسەر شاشەی تەلەفیزیۆن ، یاخوا هەرتووشی دوژمنتـان بێ‌و هەر ئەوانە پێوەی بتلێنەوە کە دژ بەهونەری کوردمانن ... من لەو باوەڕەدام ئەوەی بتوانێ بەرگەی هەڵسوڕاندنی کارێکی هونەری بگرێ ـ بەتایبەتی شانۆگەری ـ چاوقـایم‌و بەجەر گەو پاڵەوانانە بەرامبـەر گێژاوی نالەباری ژیان ئەوەستێ وەگرەو ئەباتەوە،دەسامایەی شانازیە بۆ تیپە هونەریەکانی ئێمە کە ئەم توانایەیان هەبێ وسەرەڕای هەموو دەردی سەرییەك کۆڵ نـەدەن‌و بوونی خۆیـان بەباشی بسەلمێنن*.

٥ ـ بەڕای من باشترین هەنگاو کەبۆ پێشخستنی هونەری شانۆیی

کوردی بنرێ دانانی بەرنامەیەکی ڕێك‌و پێکە لە قوتابخانەکانا بۆ وتنەوەی وانەی شانۆیی‌و پەروەردەکردنی گیانی هونەری لە ناو ئەو قوتابیە منالآنەدا کە پیاوی دوارۆژن،و پێش خستن‌و بەرزکردنەوەی هەمو کارێکی گرنگیش لەسەردەستی ئەوانا لە پاشە ڕۆژانەشوونما ئەکاو ئەگا بەئاوات ...ئەمەشی هەروەك بەرنامەکانی وانە هونەریەکانی تریَ وەکو سروود مۆسیقاو هونەری تەشکیلی‌و وەرزش‌و چنین‌و زۆروانەی سەر بە هونەریَ‌تر ..

هەروەها کردنەوەی ئامۆژگەو قوتابخانەی هونەری لە شـــارەکانی کوردستانا پێویستیەکی‌تری ئەم ڕێبازەیە ، ئەمە لەلایەکەوە بـاری گرانی سەرشانی مامۆستا شانۆیی‌یەکان سووك ئەکات‌و لە لایەکی تریشەوە هونەری شانویی بەشێوەیەك پێش ئەخات کە چاوەڕوانی دوارۆژێکی باشی لیَ بکریَ بۆ بەرزکردنەوەی هونەری شانوییمان .

٦ ــ وابزانم بوونی یەکێتی‌یـــەکی هونـــەرمەندان زۆر پێویستـــە بۆ کزکردنی ئەو گیرو گرفتە زۆرەی کە دێتە ڕیَ‌ی گەشـــەکردنی هـــونەری شانوییمان‌و لەمەو پیش هەندێکیمان باسی‌کرد ... یەکێتیەکی بەهێز کـــە بتوانیَ ئیش‌و کاری تیپەکان‌و هەموو هونەرمەندێکی لیَ‌هـــاتوو راپەڕێنیَ وڕێگا بۆ چاو هەڵهێنانی بەرهەمەکانیان خۆش بکاو لە ئەنجاما هەوڵ بدات بۆ یەکخستنی توانای هەموو هونەرمەندانی کورد لە کۆمەڵیك یان لە تیپێکی سەرەکیدا[1].

ئێمە لێرەدا باسی ئەم گیرو گرفتانە ئەکەین بەو هیوایەوە کە شانۆیەکی پاکی دلنیا بهێنینە کایەوەو بەهەموو لایەکمان بتوانین بایـــەخ‌ونرخی شـــانۆ لەخەڵکی بگەیەنین‌و بکەینە دۆستی...،بەلاَم بائەوەشمان لەبیر نەچیَ کە بن‌بڕ کردنی هەموو تەنگ‌و چەڵەمەو گیرو گرفتێك پەیوەندیەکی بەهێزی بە باری‌سیاسی وهاندانی کاربەدەستانەوە هەیەو لەو باوەڕەدام کە لەبارێکی ئالۆزاوو ڕۆژگارێکی تووڕەو ناهەموارا هەرگیز گوڵی باخی هونەرمان ناگەشێتەوەو شانۆمان پێش ناکەویَ‌و خزمەتی گەلمان ناکات...

---

(١) نەقابەی هونەرمەندان لە سلیمانی‌و شارەکانی تری کوردستانی عیراقدا لەم دوایەدا کرانەوەو ئێستا بەردەوام کار ئەکەن.

له هه‌موو خوێنه‌رێکی خۆشه‌ویست ئه‌خوازم که هه‌موو باری سه‌رنج و تێبینی یه‌کانیان له‌به‌ر ئه‌و رۆشنایییه‌دا ببینن که‌ئه‌م باسه له سالی ١٩٧٦ دا نووسراوه‌و هه‌موو بیرو راکانم زاده‌ی ئه‌و سه‌رده‌مه‌ن که بێگومان ئێستا له‌وانه‌یه هه‌ندێکیان به شێوه‌یه‌کی تر بوترێ‌و خۆی نیشان بدا .

ته‌نیا

رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد (     ) لسنة ١٩٨٥

الجمهورية العراقية
وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية
السلسلة رقم (١١١)

# المسرح والمسرح الكردي

حسن تەنیا

السعر (٨٠٠) فلس

تصميم الغلاف الفنان: اسماعيل خياط
الأخراج الفني: عبدالقادر علي مردان



طبع دار آفاق عربية للصحافة والنشر